

# ڕۆڤار

ژمارە ٨١

ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێک دەریدەکات




**سەرپەرشتیار**
**ڕەووف بێگەرد**

**بەڕێوەبەری نووسین**
**هەورامان وریا قانع**

**گرافیك دیزاین**
**ئارام عەلی**

**تایپێست**
**ئارام مەحموود**

**ناونیشان**
**سلێمانی- شارێی سالم**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

www.serdem.net

**پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی**
Rovar.sardam@gmail.com
Rovar.facebook.com

**چاپخانەی**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**نرخ: 1000دینار**

# پێڕست

# سەروتار

وەک ستافی ڕۆڤار، بە باشمان زانی ئەم ژمارەیە تەرخان بکەین بۆ شاعیری گەورەو مەزن مەولەوی. کاتێ بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە، پەیوەندیمان بە هەندێ نووسەرەوە کرد، بە تایبەتی ئەوانەی مەولەوی ناسن و لە بورای تەسەوف و سۆفیگەریدا شارەزاییان هەیەو قەڵەمێکی دیاری ئەو بوارەن و پێشتر نووسین و لێکۆڵینەوەیان، چ لەسەر مەولەوی و چ لە بواری تەسەوفدا هەبووە، خۆشحاڵانە بە گەرم و گوڕییەکی بێ وێنەوە، بەدەم داواکارییەکەمانەوە هاتن و هەریەکەی لە ئاستی خۆی، بە کۆمەڵێک وتارو لێکۆڵینەوەی تازە، لەسەر شیعرەکانی مەولەوی و تیشکخستنە سەر هەندێ ڕەهەندی شیعری ئەم شاعیرەمان، بەشداریان کرد.
خوێنەر بە خوێندنەوەی بابەتەکانی ئەم ژمارەیە، ئەو ڕاستییەی لا ئاشکرا دەبێت کە مەولەوی یەکێکە لە شاعیرە هەرە هەست ناسکەکانی کوردو شیعرەکانی پڕن لە ئاواز و سازو مۆسیقا. هەروەها خوێنەر بۆی دەردەکەوێت کە مەولەوی چ شارەزاییەکی قووڵی لە ئامێرەکانی مۆسیقادا هەبووەو زۆر سەرکەوتووانە لە شیعرەکانیدا بەکاریهێناون و کردونی بە بەشێکی زیندوو لە جەستەی شیعرەکانیدا.
لێرەدا پێویستە ئاماژە بە خاڵێک بکەین، ئەویش ئەوەیە ژمارەی لاپەڕەکانی "ڕۆڤار" دیاریکراوە و ناکرێت لەو مەودایە تێپەڕێت. بۆیە هەندێجار بە ناچاری پێویست دەکات کەمەکێک لەو وتارە درێژانە کورت بکەینەوە کە دەگاتە دەستمان، بەو مەرجەی ئەو کورت کردنەوەیە کار نەکاتە سەر سیاق و ڕەوتی نووسینەکەو کار نەکاتە سەر مەبەستی سەرەکی نووسینەکە و ناڕوونی و ئاڵۆزی لە ئامانجەکەی دروست نەکات. لە ڕاستیدا هەندێ لە نووسینەکان، زۆر لەوە بەرفراوانترە کە بکرێ لە چاپ کراوێکی وەک ڕۆڤار بڵاوبکرێتەوە، ئەو نووسینانە بۆ خۆیان پرۆژەی کتێبن و تەنها لە کتێبدا حەقی تەواوی خۆیان وەردەگرن. ئێمە پێمانخۆش بوو، تەواوی ئەو نووسینانە بێ کورت کردنەوە، بڵاو بکەینەوە، بەڵام بەداخەوە تا ڕادەیەک ئەوە نەدەکرا، چونکە وەک ئاماژەمان پێدا ئێمە پەیوەستین بەو شێوەیەی کە ڕۆڤار لەسەری بەردەوام بووە.
لێرەوە داوای لێبوردن لەو بەڕێزانە دەکەین کە ڕەنگە وتارەکانیان لە ناچاریدا کورت کرابێتەوە.

**بەڕێوەبەری نووسین**

# ژیانی مەولەوی






**محەمەد عەلی قەرەداغی**

دیار بوو ژمارەیەکی (ڕۆڤار) بۆ مەولەوی تەرخان کرا بوو، داوام لێ کرا بەشداریی تێدا بکەم. بەپێخۆشحاڵییەوە داواکەم پەسەند کرد.

لەم هەلەدا موژدەی ئەوە بە خوێنەران و شەیدایانی بەرهەمی بەرز و ناسکی مەولەوی دەدەم کە بەپێی توانای خۆم کارێکم بۆ دیوانی مەولەوی ئەنجام داوە، بە لێکۆڵینەوەیەکی نوێوە لە دوو بەرگدا پتر لە هەشتا پارچە شیعری بڵاونەکراوەی مەولەوی لەم کارە تازەدا هەیە، هەروەها (١٣) نامەی فارسی بڵاونەکراوەی مەولەوی و گەلێ شتی دی.

تا ئەوکاتە دیوانەکە بە یارمەتیی خودا دەکەوێتە کتێبخانەی کوردی و چاوی خوێنەرانی پێ ڕوون دەبێتەوە لێرەدا بە کوڵبژێرێک لە پێشەکی دیوانەکە بەشداری ئەم ژمارەی (ڕۆڤار) دەکەم.

مەولەوی ناوی عەبدوڕڕەحیمی کوڕی مەلا سەعیدی تاوگۆزییە[1] نازناوی شیعری (مەعدوومی) و (مەعدووم)ە، لەناو خەڵکدا بە (مەولەوی) ناوبانگی دەرکردووە. لە بنەماڵەیەکی مەلازادە بووە و باوباپیری تا چەند پشت، کە بەوردیی نەزانراون، مەلابوون. ڕشتەی پشتیان دەگەڕێتەوە سەر (پیرخدری شاهۆ).

مەولەوی، ساڵی ١٢٢١ک (١٨٠٦ز) لە گوندی سەرشاتەی خوارووی سەر بە کوردستانی عێراق لەدایک بووە. سەرەتای خوێندنی، وەک قورئانی پیرۆز و کتێبە وردەکان، لە لای باوکی خوێندووە، دوای ئەوە بە عادەتی فەقێ و خوێندنی ئەو سەردەمە، بۆ بەدەستهێنانی زانستی زیاتر رووی لە مەدرەسە بەناوبانگەکانی کوردستان کردووە.

---

1 دەبێ ئەوە بڵێم: لەسەر بەرگی دیوانی مەولەوییەکەی مامۆستای مودەڕیس نووسراوە (تاوەگۆزی) بەڵام من لە نزیکەوە گوێم بۆ کەسانی ناوچەی سەرشاتەی زێدی مەولەوی گرتووە،نەک یەک و دوان، یان جارو دووجار، هەموویان دەڵێن (تاوگۆزی) لە یەک کەسی ئەو ناوچەیەم نەبیستووە بلێ، (تاوەگۆزی).

ئەو شوێنانەی کە دیارو زانراون و مەولەوی بۆ خوێندن پیایاندا گەڕاوە، دەکرێ وا دەست پێبکرێت کە لە سەرەتاوە چووەتە شاری پاوەی هەورامان و، دواتر چووەتە (چۆڕ)ی سەر بەمەریوان و، لەوێوە چووەتە شاری (سنە) و لە مزگەوتی (وەزیر)دا خەریکی خوێندن بووە، دوای ئەوە رووی لە شارۆچکەی (بانە) کردووە و ماوەیەکیش لەوێ بەخوێندن و بەدەستهێنانی زانستەوە سەرگەرم بووە، دوای ئەوە رووی لە شاری سلێمانی کردووە و لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی و لەخزمەت زانای پایەبەرز، شێخ مەعرووفی نۆدێیدا زانستی وەرگرتووە. دوای ئەوە رووی لە شارۆچکەی هەڵەبجە کردووە و لە مزگەوتی جامیعەی هەڵەبجەدا، لای مەلا صادقی تەوێڵەیی، باش موستەعیدی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی، خوێندوویە. لەوێیشەوە بەرەو قەڵای جوانرۆ رۆیشتووە و ماوەیەک لە خزمەت مامۆستا مەلا محەمەدی قازیدا خوێندوویەتی و لە خزمەتیدا فێری زانست بووە.

پاشان لەوێوە بۆ جاری دووەم و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی رەزا قولیخانی والیی ئەردەڵاندا چووەتەوە سنەو لە مزگەوتی(دار الاحسان) ماوەیەک خوێندوویەتی. لەوێوە، دووبارە رووی لە سلێمانی کردووەتەوە، ئەمجارەیان لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەبدوڕڕەحمانی نۆتشەیی، موفتیی سلێمانی و مامۆستای مزگەوتی مەلکەندیدا، بوخچەی داناوە و گۆپاڵی لێ فڕێداوە و دواقۆناغەکانی خوێندنی تەواو کردووە و لەخزمەتی مامۆستا مەلا عەبدوڕڕەحمانی نۆتشەییدا ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە.

مەولەوی پاش ئیجازەوەرگرتن، سەرەتا لە گوندی چروستانەی سەر بە قەزای هەڵەبجە بووە بە مەلا. ماوەیەک دوای ئەوە چووەتە گوندی بیاوێڵەی سەر بە هەمان قەزا. ماوەیەکیش دوای ئەوە رووی کردووەتە دێی (گونە) کە خەڵکەکەی لە تیرەی تەورۆڵیی سەر بەهۆزی مورادیی بوون. پاش ئەو ماوە خزمەتەی لەو دێهاتەدا بە زانست و ئیسلام، گەڕاوەتەوە بۆ ناوچەی تاوگۆزی زێدی باوباپیرانی و لەوێ پێشەوایی ئایینی و سەرۆکایەتی رۆحانیی و سیاسیی ناوچەکەی وەک باوباپیرانی گرتووەتە دەست و لە تەک نەدارایی و دەستکورتی و ژیانی کووڕی ناوچەکەدا، بێ ئەوەی منەتی کەس هەڵبگرێ، خەریکی دەرسوتنەوە بووە و بۆ خۆی ژیانی فەقێکانی دابین کردووە.

مەولەوی لە تەک ئەوەدا، بەهۆی پلەی باڵای زانستی و ئەدەبی بێ وێنەیەوە، جێگەی رێزی پیاوانی وەک محەمەد پاشاو مەحموود پاشای جاف و، بارام بەگی مورادی و، عەلیئەکبەرخانی شەرەفولمولکی ئەردەڵانی و، حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی و ...کەسانی دی بووەو شانازییان بەوەوە کردووە، مەولەوی رێگەیان بدات خزمەتێکی بکەن و نزیکایەتییان لەمەولەوی، بەمایەی پیرۆزی زانیوە. بەڵام ئەم رازیی نەبووە -نەک بۆ خۆی- بۆ حوجرە و مەدرەسە و فەقێکانیشی شتێ لە کەسێکیان وەربگرێت. مامۆستا سەید تاهیری هاشمی ئەفەرموێ: لە کەسی باوەڕپێکراوم بیستووە کە مەولەوی خۆی بە گا، جووتی کردووە و، زەویی خۆی تۆو کردووە و، دواییش خۆی درەوی کردووە و هێناویەتییە ناو و هەر بەوە ژیانی خۆی و فەقێکانی دابین کردووە و، وابووە، ئەو بەری رەنجەی کورتی هێناوە و بەشێکی ساڵەکەی بە بەڕوو بەسەربردووە. ئەمە لە کاتێکدا بووە گەورەپیاوان و بەرپرسانی وەک فەرهاد میرزا (معتمد الدوله) و کەسانی دی خۆیان داوایان لێکردووە بچێتە شوێنێکی وەک سنەی پایتەختی ئەردەڵانی ئەو سەردەمەو زۆر بەئاسوودەیی بژی و زانست بڵاوبکاتەوە.

## خێزان و مناڵی مەولەوی

ئەوەی لە پاشماوەی بنەماڵەی مەولەویمان بیستووە ئەوەیە کە مەولەوی تاقە ژنێکی هێناوە و ئەو ژنەیش (عەنبەرخاتوون)ی خوشکی (ئەکرەم) ناوی ئەفغانی بووە کە یەکێ بووە لە چەند ئەفغانییەک لەوڵاتی خۆیانەوە کۆچیان کردووە بۆ کوردستانی بابان و لە پەنای پاشای باباندا خۆیان گرتووەتەوە.



مەولەوی عومرێکی باش و خۆش و پڕخۆشەویستیی لەگەڵ عەنبەرخاتوون بەسەربردووە. ئەمەش بەوەدا دەرئەکەوێ کە بە مردنی عەنبەرخاتوون، دنیا لەپێش چاوی مەولەویدا تاریک بووە و، گەلێ پارچە شیعری ناسکی پڕسۆزی لە لاواندنەوەیدا وتووە کە بەرزترین نموونەی شیعری خۆشەویستی و لاواندنەوەن لە ئەدەبی کوردیدا.
مەولەوی لە عەنبەر خاتوون چەند کوڕو کچی بووە. کوڕەکانی ئەمانەن:
١- سەیید محەمەدی کە گەورەبووە و ژنی هێناوە، بەڵام لە ژیانی مەولەوی خۆیدا، بە گەنجی مردووە و لە دێی (گونە) بەخاک سپێرراوە.
ئەم شێخ محەمەدە تاقە کوڕێکی بووە کە ناوی محەمەد سەعید بووە و وەچەی لێ کەوتووەتەوە.
٢- شێخ محەمەد: کە ئەمیش گەورە بووە و ژنی هێناوە، بەڵام بە گەنجیی مردووە و کوڕێکی لێ بەجێماوە کە ناوی عەلی بووە. ئەمیش هەروا وەچەی لێ کەوتووەتەوە.
٣- سەیید عەبدوڵڵا: کە زۆر ژیاوە و چەند ژنی هێناوە و گەلێ وەچەی لێ کەوتووەتەوە.
٤- هیدایەت: کە بەگەنجی بەر لە ژنهێنان مردووە.[2]
لە وەچەی ئەم کوڕانەی مەولەوی یەکێکیان ناوی شێخ عەبدوڵڵا و خوێندەوار و ئەدەبدۆست بووە. لە کەشکۆڵی عەبدولقادردا کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە خەتی ئەو شێخ عەبدوڵڵایە هەیە.




## مەولەوی و عەبدوڵڵا پاشاو عەنبەرخاتوون

خانەوادەی عەنبەرخاتوون بەهۆی ڕووداوێکەوە، لە ئەفغانستان هەڵکەنراون و گەیشتوونەتە کوردستان و لە پەنای میرانی باباندا حەساونەتەوە.عەنبەرخاتوون خوشکی ئەکرەم خانی ئەفغانی بووە، ئەکرەم خان لەناو ئەو ئەفغانییانەدا کە هاتوونەتە کوردستان لە هەموویان دیارتر بووە.عەنبەرخاتوونی خوشکی، ئافرەتێکی شۆخ و هەڵکەوتوو بووە. عەبدوڵڵا پاشای بابان بەوەی زانیوە، ویستوویەتی عەنبەرخاتوون بۆ خۆی بخوازێ. بۆ ئەم مەبەستە مەولەوی ناردووە بۆ لای ئەکرەم خان بۆ خوازبێنی.
کە مەولەوی دەچێتە لای ئەکرەم خان و باسەکە دەدرکێنێ، ئەکرەم خان دەڵێ: من ژن نادەم بە عەبدوڵڵا پاشاو بڕوام نەدەکرد تۆ -واتە مەولەوی- بۆ داوای وا بێیت بۆ لای من. مەولەوی دەڵێ: ئەی بەکێی دەدەیت؟ ئەکرەم خان دەڵێ: ئەگەر بۆ خۆت بهاتایەیت ئەوا عەنبەرخانم دەدایتێ. مەولەوی دەگەڕێتەوە بۆ لای عەبدوڵڵا پاشاو باسەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. عەبدوڵڵا پاشا توورە دەبێت و سوێند دەخوات کە نەهێڵێ عەنبەرخاتوون شوو بکات بە کەس. مەولەوی دەڵێ: بە منیش؟ عەبدوڵڵا پاشا دەڵێ: بۆ تۆ دەستەڵاتم نییە و ئەگەر بیدەن بە تۆ، خۆم بەرگیشی بۆ دەکەم. بەم شێوە مەولەوی دەبێ بەهاوسەری عەنبەرخانم.[3]

## ڕشتە و بنەچەی مەولەوی

سەرچاوەکان ڕشتەی پشتی مەولەوی دەگێڕنەوە بۆسەر مەلا ئەبوبەکری موصەننیف و لەویشەوە بۆ سەر پیرخدری شاهۆ.
لەو سەرچاوانەدا یەک دوو پشتی مەولەوی نووسراون، بەڵام بەپێی شەجەرەیەکی بنەماڵەی مەولەوی کە لە دەستدایە و مۆرو پشتگیریی زانایان و گەورەپیاوانی پێوەیە، ئەو ڕشتە ڕوونتر دیارە و زیاتر ناوی باو باپیرانی مەولەوی ئاشکرایە، بۆیە وەک ئەو شەجەرە لە ناوی مەولەوی خۆیەوە تا سەر مەلا ئەبوبەکری موصەننیف دەنووسم و لەوەولاش وەک ئەو شەجەرە وایە کە ڕشتەی بنەماڵەی مەلا ئەبوبەکری موصەننیفی تێدا تۆمار کراوە:
سەیید مەلا عەبدوڕڕەحیم، کوڕی سەیید

٢ بڕوانە: یادی مەردان، ٣٧٩/٢.

٣ ئەم باسەم لە دەمی سەید موحسینی تاوگۆزی وەرگرت.

سەعید، کوڕی سەیید شەریف، کوڕی سەیید مەحموود، کوڕی سەیید یوسف جان، کوڕی سەیید جەمالەدین،کوڕی سەیید کەمالەدین، کوڕی مەلا یوسف جان، کوڕی سەید حەسەنی ناسراو بە مەلا ئەبوبەکری موصەننیف، کوڕی سەید هیدایەتوڵڵا، کوڕی سەیید یوسف جان، کوڕی سەیید یەعقووب جان..

ئەم شەجەرە بە خەتی مەلا حامیدی کاتب، نووسراوەتەوە و مۆری گەلێ لە زانایانی ئەو سەردەمەی بەسەرەوەیە.

دەقی شەجەرەکە درێژە و لێرەدا نەگونجا.

## کۆچی دوایی مەولەوی

مەولەوی پاش ئەوەی تەمەنێکی نزیکی هەشتا ساڵی بە سەربەرزی و مەردانە، بەڵام بە ژیانێکی کولەمەرگی و پڕ لە سەختی و دژواری و نەبوونی و برسێتی و نەدارایی بەسەربرد، گیانە بەرزە پڕ هەستە ناسکەکەی بەرزەفڕ لە شەقەی باڵی داو بەسەربەرزی و رووسووری بێ ئەوەی دنیا لەکەداری بکات گەڕایەوە بۆ بارەگای پەروەردگار و بەهەشتی بەرینی ئەو.

لە هۆی کۆچی دواییەکەیدا دەگێڕنەوە:

((جارێکیان بۆ سەرخۆشیکردن لە دۆستێکی ئەڕوات بۆ (پریس)، کە لە گەڕانەوەدا نزیکی (هانەسوورە) ئەبێتەوە بە جڵەوڕاکێشی وڵاخەکەی ئەڵێ: من چاوم نابینێ، دارتوویەک لەسەر رێگەمان لقێکی لاری هەیە رێگەکەی گرتووە، کە گەیشتینە لای پێم بڵێ با سەرم دانەوێنم. وا رێ ئەکەوێ کە ئەگەنە ئەو شوێنە کابرا لە بیری نابێ ئاگاداری بکا، مەولەوی سنگی ئەدا بە دارەکەداو بە پشتا ئەکەوێتە خوار لە وڵاخەکەی و پشتی ئەشکێ. لە ئەنجامی ئەوەدا لە ١٣٠٠ی هیجریدا کۆچی دوایی ئەکا و لە گۆڕستانی (ئەصحابە) لە نزیکی (سەرشاتە) ئەی سپێرن بە خاک))[4]

ئەوەندە هەیە -وەک لەمەولا روونی دەکەمەوە- مەولەوی لە مانگی شەوالی ساڵی (١٢٩٩) ی ک دا کۆچی دوایی کردووە.[5]

## هاوەڵانی مەولەوی

وەک لە دابەشکردنی شیعرەکانی مەولەویدا بەئاشکرا دیارە، شیعر نامە، یان نامەی شیعری، بەشێکی گەورە و سەرەکیی دیوانی مەولەوییە . ئەوەیش روونە کە نامە بۆ دۆستان و هاوەڵان و لە وەڵامی هاوەڵاندا دەبێت. بەڵام لەو هەموو نامە شیعرییەی مەولەویدا، چەند کەسێکی کەم ناسراوو زانراون و -لەوانیش کەمتر وەک نووسیم- نامەیان دیارە...

دەگونجێ لە ڕیزی هاوەڵانی مەولەویدا، لا بەلای چەند جۆرە کەسایەتیدا بکرێتەوە، کە هەر یەکەیان بەشێوەیەک لە شێوەکان پێوەندیی پێیانەوە بووە و، لە لایەنێک لە لایەنەکانی ژیانیدا سوودی لێوەرگرتوون، یان کاریگەرییان لە رووی زانستیی و ئەدەبیی و ئایینییەوە بەسەرییەوە بووە.

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە (یادی مەردان)دا ناوی (٢٠) کەسێک لە دۆستانی مەولەوی، بەتێکەڵی، نووسیوە. بەڵام مامۆستا سەید تاهیر بابەتیانەتر هاوەڵانی مەولەوی ڕیزکردووە و شتێکی لەسەر نووسیون. لەبەر رۆشنایی هەردوو سەرچاوەکەو ئەو زانیارییە تازانەدا،کە خۆم لەم بارەوە دەستمخستوون، باسی هاوەڵانی مەولەوی دەنووسم:

١- شێخ عەبدوڵڵای (داخی): زاناو شاعیر بووە و، دۆست و خۆشەویستی مەولەوی بووە، نامەی شیعرییان بۆ یەکتر ناردووە. دوای کۆچی دوایی مەولەوی، داخی شیوەنێکی بەسۆزو ئەدیبانەی بۆ کردووە. بەپێی نووسینی د.محەمەد صدیقی موفتیزادە، دەبێ (داخی) خەڵکی خەرپانی بووبێت، بەو پێیەش، دوور نییە لە نەوەی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی یان خزمی بووبێت.





---

٤ لە بارەی ژیانی مەولەوییەوە بڕوانە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، چاپی یەکەم، بەغدا، لە چاپخانەی (بە ئۆفسیت چاپکراوەی کوردستان).

هەروەها:مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری، بەرگی دووەم، ل: ٣٦٢

هەروەها:دەستخەتی (ها/١) ی دەستخەتی مامۆستا سەید تاهیری هاشمیی.

هەروەها: مەلەوی: ژیان و بەرهەمی، محەمەدی مەلاکەریم، میهرەجانی مەولەوی، ساڵی ٢٠٠٠.

٥ بڕوانە: دەستخەتی (ش) دەستخەتی حەسەنی شەریف ئابادی.


ژماره — ٣

دیوانی مولوی

و

روحی مولوی

پیکەوە

فورمەی «٨» فاسە

له چاپخانەی سلیمانی چاپ کرا

١٩٣٥ م ١٣٥٤ ه

٢- ئەحمەد بەگی کۆماسی: شاعیری گەورە و ناودار و هاوفەردی مەولەوی، مەولەوی هەرکات لە دیوانەکەیدا ناوی (خالۆ)ی هێنابێت، بەزۆریی، مەبەستی ئەم شاعیرە بووە.

٣- شێخ یوسفی نۆسمەیی: ئەم پیاوە لە بەگزادەکانی وەڵەدبەگی بووە، مەولەوی لە شیعرەکانیدا، بۆ ئەمیش خاڵۆی بەکارهێناوە. یەکێک لە پارچە شیعرە جوانەکانی مەولەوی لە باسی ڕاوو شکاردا بۆ ئەم پیاوەیە.

٤- بولبول: یەکێکە لەو شاعیرانەی نامەیان بە شیعر بۆ مەولەوی ناردوە. ئەم شاعیرە، شاعیرێکی تەڕدەست و شیعرسوار بووە. بە تەمای کچێکی مەولەوی بووە، پێش ئەوەی ئەم باسی بکات، مەولەوی کچەکەی بەشوو داوە، دوایی بولبول باسەکەی بە شیعر بۆ مەولەوی درکاندووە و مەولەویش وەڵامی داوەتەوە.

لەیەکێک لە بەیاضەکانی شیعری مەولەویدا، دەڵێ: بولبول ناوی مەلا ڕەحیم بووە. لەمەوە، ئەوە دێتە پێشەوە، دەبێ مەلا ڕەحیمی نەجاڕیی کە مەولەوی نامەی بە شیعر بۆ نووسیوە هەر ئەم بولبولە بێت یان کەسێکی جیاوازبێت؟ ئەمەیش باسێکە دەبێ چاوەڕوانی داهاتوو بین بۆی.[٦]

٥- یوسف بەگی کوڕی عەبدوڵلا بەگی شەرەف بەیانیی: ئەم یوسف بەگە برای عەزیز بەگی میر پەنج (میرپنج) بووە، کە پیاوێکی جوانخاس بووە و مەولەوی دۆستایەتیی لەگەڵ خۆی و باوکیدا بووە. زیاتریش لەبەر ئەوە کە کچی عەبدوڵلا بەگ خێزانی شێخی سیراجەدین بووە.

٦- یەکێکی دی لە هاوەڵە شاعیرو ئەدیبەکانی مەولەوی مەلا محەمەد صاڵحی فەخرولعولەما بووە: ئەم پیاوە لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانە، لە لقی ناوچەی (بێڵەوار) و، لەو تاقمە شێخانە بووە کە لە دێی (دەژن) دانیشتوون. ئەم پیاوە شاعیر بووە و، مامۆستای مودەڕیس لە یادی مەردانادا چەند پارچە شیعری بڵاوکردووەتەوە.

٧- مەلا مەحموودی دشەیی: ئەم زاتە، ئینسانێکی زۆر پیاوچاک و خواپەرست و دەست لە دنیا شۆردوو بووە. هەر لەبەر ئەم ڕەوشتانەی بووە کە شێخی سیراجەدین کردوویەتی بە مامۆستای گەلێ لە کوڕەکانی.

٨، ٩، ١٠، ١١- مامۆستای مودەڕیس ناوی چوار لە هاوەڵانی مەولەوی بەیەکەوە هێناوە کە ئەم زاتانەن: شێخ عەبدولقادری موهاجیر، شێخ

٦ مامۆستای مودەڕیس دەفەرموێ: (بولبول) نازناوی شێخ حەسەنی سازانی بووە.



جەسیم، شێخ نەسیم و شێخ وەسیمی کوڕانی شێخ محەمەد سەعیدی تەختەیی، مودەڕیسی مەدرەسەی دارولئیحسانی سنە، کە ئەمانە لە نەوەی شێخ ئەحمەدی عەللامەن و لە بنەماڵەی مەردۆخین.

کاتێ کە مەولەوی لە مزگەوتی دارولئیحسانی سنە فەقێ بووە لە سەفەری دووەمیدا بۆ سنە بۆ خوێندن، بووە بە هاوڕێ و دۆستی ئەم برایانە و دۆستایەتییان تا دوایی هەر بەردەوام بووە.

١٢- یەکێکی تر لە دۆستان و هاوەڵانی مەولەوی، شێخ موئمین سازانییە: ئەم زاتە خەلیفەی شێخ محەمەد بەهادین بووە و مەولەوی زۆری ڕێز لێگرتووە و، لە سەرەتای پارچە شیعرێکیا بەم جۆرە قسەی لەگەڵ ئەکات:

نەتیجەی پاکدین، شێخ سازانی!
خاس وەتەن نەتۆی دەروون سازانی

١٣- حاجی مەحموودی یاروەیس: ئەم پیاوە وەکیل و مەسرەفداری مەحموود پاشای جاف بووە. مەولەوی دۆستایەتییەکی پتەوی لەگەڵ ئەم پیاوەدا بووە، وەختێ عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەم حاجی مەحموودە بە گوللەی وێڵ کوژراوە، مەولەوی شینێکی بەسۆزی بۆ کردووە، ئەو شینەی مەولەوی بۆ کوڕی مەحموودی یاروەیس کە (٦٥) بەیتە درێژترین پارچە شیعری کوردیی مەولەوییە.

١٤- مەلا فەتاحی جەباری: ئەم پیاوەیش شاعیرێکی ناسکی سەر زاراوەی گۆرانە، دیوانەکەی کۆنەکراوەتەوە، شیعرەکانی تێداچوون، جەبار جەباری هەندێک لە شیعرەکانی بڵاوکردبووەوە، لەم دواییانەدا هەندێ لە شیعرەکانیم دەستکەوت، لە بەرگی حەوتەمی کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیدا بڵاومکردنەوە.

١٥- نیزام: ئەم زاتەیش شاعیرێکی هاوچەرخی مەولەوی بووە و بە شیعر نامەی بۆ مەولەوی نووسیوە و مەولەویش هەر بە شیعر وەڵامی داوەتەوە، شیعری هەردوکیان لە دیوانی مەولەویدا لە چاپی مامۆستادا بڵاوبووەتەوە.

ئەوەی تا ئێرە باس کرا، ئاماژە بوو بە ناوی دۆستان و هاوەڵانی مەولەوی، لە شاعیران و ئەدیبان و پیاو ماقووڵان، وەک مامۆستایان: سەید طاهیر هاشمی لە دەستخەتی (ها/١) داو مامۆستای مودەڕیسیش لە یادی مەرداندا نووسیویانە.

منیش دوای پشکنینی بەیاض و دەستخەتی زیاترو وردبوونەوە لە شیعرەکان ناوی دووسێ هاوەڵی دیکەی مەولەویم لە شاعیران و ئەدیبان بۆ دەرکەوتووە، لێرەدا باسیان دەکەم:

١٦- سەودایی: شاعیرێکی هاوچەرخی مەولەوییە، نامەی بۆ مەولەوی ناردووە و مەولەویش بە نامەی شیعری، وەڵامی داوەتەوە. یەکەم جار لە بەرگی هەشتەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورددا ئاماژەم بۆ ئەم مەبەستە کردووە.

لەم لێکۆڵینەوە نوێیەی دیوانی مەولەویشدا، پارچەیەک شیعری بڵاونەکراوەی مەولەویم دۆزیوەتەوە کە بۆ ئەم سەودایییەی نووسیوە و سەرەتاکەی ئاوایە:

«حسب الاشارەی سەودایی کامڵ».

١٧- مەحزوون: ئەمیش شاعیرێکی هاوچەرخی مەولەوی بووە و نامەی شیعرییان ئاڵ و گۆڕ کردووە و، مەولەوی پارچە شیعری:

«بڵێسەی ئایر نە دڵ خێزاوە»...ی بۆ ئەم پیاوە نووسیوە.

١٨- زەهاویی: نازانم زەهاویی کێیە، ئەوەندە هەیە لەو پەخشانانەدا کە لە پاڵ چەند پارچە شیعرێکیدا نووسیومە، ئاماژەی بۆ زەهاویی ناوێک کردووە و دەنووسێ: بنێرن با زەهاوییش بێت، دیارە بۆ ئەو جێگە و شوێنانە بووە کە مەولەوی و هاوەڵانی تێدا کۆبوونەتەوە و لەوانەیە بووبێ بە کۆڕێکی ئەدەبیی باڵا، چونکە باس باسی خوێندنەوەی شیعرەکانی مەولەوییە.

١٩- ئەحمەد پریسیی: کە یەک دوو جار، لە دیوانی مەولەویدا ناوی هاتووە، بەڵام هیچ کام لە مامۆستایان، مودەڕیس و هاشمی لە ڕیزی هاوەڵەکانی مەولەویدا، باسیان نەکردووە.

٢٠- خەلیفە کەیخەسرەو: بەپێی دوو پارچە شیعر کە لە نێوانی خەلیفە کەیخەسرەو و مەولەویدا ئاڵوگۆڕ کراون، وا دیارە، یەکێک لە هاوەڵانی



سەردەمی پیریی مەولەوی بووە، کە دوور نییە، وەک هاوەڵی پیریی بووە، ئەو هاوەڵییەتییە، درێژەپێدراوی کاتی گەنجێتیشیان بووبێت.
سەرەتای پارچە شیعرەکەی مەولەوی کە وەڵامی پارچە شیعرێکی خەلیفە کەیخەسرەوی پێ دەداتەوە، ئەمەیە:

**خاڵۆی سەردەفتەر نازک خەیاڵات!**
**دێباجەی کیتاو ساحێب کەماڵات!**

مامۆستا سەیید ئیبراهیمی ستوودەیش ناوی (١٠) کەس لە هاوەڵانی مەولەوی نووسیوە، کە سیانیان لە ناو ئەمانەدا نین، من نووسیومن، ئەوانەیش بریتین لە:
٢١- شێخی سازانی: ئەمە دوور نییە هەر شێخ موئمینی سازانی بێت.
٢٢- مەحروومی یان (مەحرووم): ئەمەیش یەکێکە لە شاعیرە هاوچەرخەکانی مەولەوی و شیعری ناردووە بۆ مەولەوی تا شیعری ئەم -مەحرووم-ە لەگەڵ شیعری (خانا)دا بەراورد بکات، مەولەویش بە پارچەی (نەوباوەی خەیاڵ) داوەریی لە نێوانیاندا کردووە.[7]
٢٣- حاجی شێخ حسەینی هەزارکانیانی:
٢٤- مەلا فەتاحی قەڵوەزەیی: نازانم ئەم مەلا فەتاحە هەر مەلا فەتاحی جەبارییە یان مەلا فەتاحێکی دییە![8]
٢٥- مامۆستا حەمەی حەمە باقییش، ناوی چەند کەسێکی لەوانە هێناوە کە لە تەک مەولەویدا نامەیان ئاڵوگۆڕ کردووە، لەوانە: شێخ عەبدوڕڕەحمانی داخی، (دەبێ هەڵەبێت و راستەکەی شێخی عەبدوڵڵای داخییە) شێخ حەسەنی سازانی (بولبول)، (ئەمەیش هەڵەیە و بولبول ناوی مەلا رەحیمە). مەلا عەبدوڕڕەحمانی نەجاڕ (ئەمیش مەلا رەحیمە نەک مەلا عەبدوڕڕەحمان)[9]
٢٦- مەلا چراخ.
٢٧- زێبا خانم: من لە دیوانی مەولەویدا نامەی (مەلا چراخ) و (زێبا خانم)م نەدیوە.[10]
٢٨- شێخ عەبدولقادری دەرەدزانی: مەولەوی نامەی پەخشانی فارسی و شیعری کوردیی بۆ نووسیوە و، لەم لێکۆڵینەوەدا دەیبینن.
٢٩- شێخ مستەفای سەقزیی: مەولەوی شیعری بۆ ناردووە، لەم دیوانەدا نموونەی هەیە.
٣٠- شێخ یەحیای قزڵبلاقی، باپیری شێخ محەمەدی قزڵبڵاقی کە ساڵی ١٢٢٩ لەدایک بووە وساڵی ١٢٩٣ی کۆچی لە دونیا دەرچووە، لەگەڵ مەولەویدا پێوەندییەکی نزیکی بووە.
ئەم شێخ یەحیا لە کۆتایی عەقیدەی مەنضوومەی فارسیی مەولەوییەوە -کە دەبێ (الفوائح) بێت- بە فارسی مێژووەکەی نووسیوە کە ئەمە کوردییەکەیەتی:
(( تەواو بوو نووسینەوەی عەقیدە فارسیەکەی گەورە و سەروەری ئێمە لە هەردوو دونیادا، سەید عەبدوڕەحیمی مەشهوور بە مەولەوی لە خزمەتیدا، سایەی لەسەر ئێمە هەر بەردەوام بێ و بەرەکەت و فائیدەشی بە ئێمەش بگا، لە گوندی جانەوەرە، بە دەستی یەحیا کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ عەبدوڵڵای قزڵبڵاقی. لە نووسینەوەی ئەم شیعرانەدا، دوو برای خۆشەویستم، شێخ ئیسماعیل و شێخ عەزیزی جانەوەرەیی یارمەتییان داوم، لەساڵی ١٢٨٩ دا))[11]
٣١- مەلا فەتحوڵڵای قازیی کوردستان، برای شێخولئیسلام، نامەی بۆ مەولەوی نووسیوە و مەولەویش وەڵامی داوەتەوە.
٣٢- شێخ مەحموودی موفتیی هەڵەبجە، کوڕی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی:
ئەم ناوە و ناوی شێخ مستەفای کوڕیم خستە ئێرە، بۆ ئەوەی کەمێک لە عاستیاندا بوەستم: مەولەوییەک کە بە فەقێتی لە خزمەتی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانیدا بووبێت و، ماوەیەک




٧ ئەمە ئەگەر هەر یەک (مەحرووم) یان (مەحروومی)مان هەبێ، ئەوە دەبێ ئەم (مەحروومی)یە بێ کە ناوی میرزا عەبدوڵڵای کوڕی میرزا ئەحمەدی پاوەیی (رەمال)ە. ئەم میرزا عەبدوڵلایە ساڵی ١٣١٠ی ک کۆچی دوایی کردووە.
(بڕوانە: محەمەد ڕەشیدی ئەمینی. کەشکۆڵی هەورامان، بەرگی یەکەم. هەولێر، ٢٠١٢، ل: ٧٦.)
٨ بڕوانە: كنگرەء بزرگداشت مولوى كرد، سقز، شهريور ٧١ انتشارات صلاح الدين أيوبى(اروميه)، چاپ، اول.

٩ سەرچاوەی پێشوو.
١٠ سەرچاوەی پێشوو، ل:٤٩٧.
١١ بڕوانە: دیداری مەولەوی.

دەرسی لە مەدرەسەی خەرپانیدا خوێندبێت و، دواتریش هاوەڵی گیانیی و هاودەمی کۆڕو کۆمەڵ و دیوەخانی موفتیی بووبێت و، دیوەخانی ماڵی موفتیی جێگەی خوێندنەوەی شیعر و هەڵسەنگاندنی لە لایەنی ئەدیب و ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەوە بووبێت، کەچی سەرچاوەکان لێی بێدەنگ بن، یان ئاگایان لێی نەبێت، کە ئەو بنەماڵە و دیوەخانەکەیان لە سەردەمی مەولەویدا چەند ناسراو بوون و چ ناوبانگێکیان بووە، دەبێ هاوەڵانی مەولەوی لە کەسانی نەناسراو و کەمناسراو چەند بن و، چەند کەس هاوەڵی بووبن کە ئێمە ئێستە هیچیان لە بارەوە نازانین؟!

## دانراوەکانی مەولەوی

ئەم زاتە لە بەر ئەوە کە شوێنێکی موناسبی نەبووە تیا بحەسێتەوە و ڕێگایەکی شک نەبردووە گوزەران و ژیانی خۆی بە ڕێکوپێکی لێوە دابین بکاو زۆر وەختی ژیانی لە گواستنەوەدا بووە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەبوو هیچ نووسراوێکی لە پاش بەجێ نەمایە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، گەلێ کتێبی بەنرخی نووسیوەو زۆریان ماون و، دیوانێکی شیعریشی لێ بەجێماوە کە نوسخەی زۆری لێ نووسراوەتەوە و بە گەلێ ناوچەی کوردستانا بڵاوبووەتەوە.

ئەم دیوانە یەکەمجار لە ساڵی ١٩٣٥ دا بە دووبەرگ لەگەڵ وەرگێڕانیدا بە شیعر، بۆ دیالێکتی کرمانجیی خواروو لە لایەن پیرەمێردەوە بڵاوکراوەتەوە، جاری دووەمیش مامۆستای مودەڕیس بە لێکدانەوەوە ساڵی ١٩٦١ بڵاوی کردووەتەوە.

مەولەوی جگە لە دیوانەکەی ئەم دانراوانەی هەیە:

١- کتێبێکی کوردی، بە شیعر، لە بارەی عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامەوە.

ئەم کتێبە هێشتا چاپ نەکراوە – مامۆستای مودەڕیس ئەفەرموێت:- من خۆم نوسخەیەکیم لە لایە. بەڵام ئێستە هەواڵی ئەم نوسخە نازانرێت.

٢- عەقیدەی مەرضییە: بە شیعری کوردی، لەبارەی عەقیدەی فیرقەی ئەشعەرییەوە کە دوو هەزار بەیت زیاترەو، ساڵی ١٩٨٨ مامۆستای مودەڕیس بەلێکدانەوەوە چاپی کرد.

٣- (الفوائح) بە زمانی فارسی، ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٩٥دا بە کۆششی مامۆستای مودەڕیس بە لێکدانەوەوە، چاپکرا. شایانی باسە، نوسخەی ئەم کتێبەم بە خەتی مەولەوی خۆی لە (الدار الوطنیە للمخطوطات) دا دۆزییەوە و لە کاتی چاپکردنی لێکدانەوەکەی مامۆستادا بەراورد کراو سوودی باشی لێوەرگیرا.

٤- نامیلکەیەکی لەبارەی ئیسباتکردنی دروستیی (ڕاطبە)وە کە یەکێکە لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی. ئەم نامیلکە بە فارسییە، نوسخەیەکی لای شێخ حەیدەری کوڕی شێخ جەعفەر هەیە کە لە دێیەکی لای (سەیدصادق) دائەنیشێ. ئەم نامیلکە تا ئێستە چاپ نەکراوە.

٥- کتێبێکی بە شیعری عەرەبی ڕەجەز، بەناوی (الفضیلە)وە هەیە کە (٢٠٣١) شیعرە لە بارەی زانستی ئوسووڵی دینەوە. ئەم کتێبە کتێبێکی زۆر بایەخدارە. مەولەوی بە فەرمانی شێخ محەمەد بەهادین دایناوە و لە سەردەمی ژیانی خۆیدا زۆر خوێنراوە. مامۆستای مودەڕیس شەرحێکی کردووە بە ناوی (الوسیلە فی شرح الفظیلە) و ساڵی ١٣٩٢هـ ١٩٧٢ز ئەم کتێبەی بە قەوارەی (٨١٩) لاپەڕە چاپکرد.

٦- مامۆستا ئەفەرموێ: لە خوالێخۆشبوو سەیید عەبدوڕەحمانی عازەبانیم بیستووە ئەیفەرموو: لە بیارە لە خزمەتی شێخ نەجمەدیندا کتێبێکم دی ناوی (خاطیراتی مەولەوی) بوو گەلێ شتی بە سوودی لە بارەی مەولەوییەوە تیا بوو. ئەبێ ئەم کتێبە فەوتابێ وا شوێنەواری لەهیچ لایەکەوە دیار نییە.

٧- منیش نامیلکەیەکی بچکۆلەی مەولەویم بە هۆنراوەی کوردی دۆزییەوە، یەکەمجار، ساڵی ١٩٧٧ لە کۆڕی زانیاری کورد، چاپم کرد. دواتر نوسخەی دیکەی دەستخەتیم دۆزییەوە و ساڵی ١٩٩٣ لە ژمارە ١٣٠ی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا بڵاومکردەوە.






٨- هەروەها بەشێک لە کتێبێکی پەخشانی کوردیی مەولەویم دۆزییەوە لە بەرگی هەشتەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایاندا بڵاومکردەوە، ئەم پەخشانە وەک ئەوە وایە کە مەولەوی خۆی کتێبی عەقیدەی مەرضییە کوردییەکەی خۆی، کە بە هۆنراوەیە، کردبێ بە پەخشان، بەڵام تا ئێستە لەو ئەندازەیە زیاتر لە دەستدا نییە.

٩- زوبدەی عەقیدە: کتێبێکی هۆنراوەی شیعری کوردییە لە بارەی عەقائید و زانستی کەلامەوە، ساڵی ٢٠٠٠ بەکۆششی حەمەصاڵحی حاجی مەلا محەمەدی گەلاڵەیی بڵاوکرایەوە.

١٠- مامۆستا سەید طاهیری هاشمی، ناوی نامیلکەیەکی لە ئوصووڵی تەریقەتی نەقشبەندییەدا بە فارسی دێنێ،نازانم هەر مەبەستی نامیلکەی (اثبات رابطە)یە یان شتێکی ترە؟

١١- منشآت: نامە فارسییەکانی مەولەوی، نوسخەیم لە لایەن کاک حەسەنی مامۆستا سەید تاهیری هاشمییەوە دەستکەوت، (٢٦) نامەی فارسی مەولەوی تێدایە. ساڵی ١٣٨٦، عەبدوسەلامی شێخ حەسەنی (توریوری) نووسیویەتییەوە.

١٢- توسل نامەء مولوی بە رجال سلسلەی طریقەی قادر یە تا حضرت کاک أحمد شیخ. ئەمەش دانراوێکی دیکەی مەولەوییە کە یەکەم جار من دۆزیمەوە و دواتر دامە خزمەتی جەنابی -مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و لە کۆتایی کتێبی (فوائد الفوائح)ەوە بڵاویان کردەوە.[١٢]




١٢ **بڕوانە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم، ل:٢٣٩.**

**هەروەها بڕوانە: فوائد الفوائح. تألیف ملا عبدالکریم مدرس در شرح منضومەء فوائح، تألیف حضرت استاد معنوی عبدالرحیم معدومی مشهور بە مولوی. بغداد ١٤١٦ م ١٩٩٥ هـ ص:٣٧١.**

# مەولەوی تاوەگۆزی و موزیك و گۆرانی ئایینەكانی كورد





**محەمەد حەمە باقی**

سەرنج : ئەم وتارە پوختەیەکی چڕکراوەی کتێبێکی گەورەی ئامادەی چاپە، بەناوی:
خوێندنەوەیەکی تازەی مەولەوی تاوەگۆزی

(١)

موزیک و گۆرانی بە گشتی و موزیک بە تایبەتی لە شیعری مەولەوی تاوەگوزی (١٨٠٦ ـ ١٨٨٢ز) دا، دیاردەیەکی ئەوەندە زەق و بەرچاوە، کە دەتوانین بڵێین نەک هەر لەناو زنجیرەی شاعیرانی دیالێکتی (گۆران)دا، بەو ئەندازەیە ئاوەڕی لێنەدراوەتەوە، بەڵکو لای شاعیرانی دیالێکتە جیاوازەکانی تری کوردیش، بەو چەندایەتی و هوشیاریی و ڕێز و شکۆیەوە، باس لە موزیک و گۆرانی نەکراوە. لەم رووەوە کەم شیعر و قەسیدەی مەولەوی هەیە، ئاماژەی بە موزیک و ئامێرەکانی موزیک نەکردبێ. ئامێرەکانیش ئەوەندە ورد و شارەزایانە باس دەکات، مەگەر هەر ئەو کەسانە بیزانن، کە بە تایبەتی لە بوارێکی موزیکدا کاریان کردبێ، یان ڕاستەخۆ خۆیان یەکێک لە ئامێرەکانی موزیکیان ژەندبێ.

ئەم تایبەتمەندییەی مەولەوی تاوەگۆزی، لەو کاتانەدا ئاشکراتر دەردەکەوێ، کە بۆ ئەم مەبەستە بەراوردێک لە نێوان شیعری مەولەوی و شیعری شاعیرانی هاودیالێکت و هاوسەردەم و هاوناوچەکەی خۆی، وەک نموونەی: ئەحمەد بەگیکۆماسی و مەلا مستەفای بێسارانی دا بکەین، کە ئەگەرچی ئەوانیش وەک مەولەوی لە هەمان کەش و هەوای کۆمەڵایەتی و ئابووریدا ژیاون و دۆستایەتی بەتین و نامەی

شیعرییش لە نێوانیاندا هەبووە، بەڵام ئاماژەکانی ئەوان بۆ موزیک و گۆرانی، نەک هەر بە ئەندازەی ئاماژەکانی مەولەوی نییە، بەڵکو بە ئاستەمێک هەست بە بوونی هەندێ وردە ئاماژە بۆ موزیک و گۆرانی دەکەین.. ئەمە لە کاتێکدا کە دیالێکتی گۆران،خۆی لە خۆیدا جۆرە ئاواز و ترپە (ئیقاع) ێکی موزیکی زۆر شیرین و شاراوە، لە هەوێن و دووتوێی واژەکانی خۆیدا حەشارداوە ، شێوەزارێکیشە ، هەر دەڵێی لە بنەڕەت و بناواندا بۆ ئەوە دروست بووە، تا شیعری پێ بنووسرێ. بۆیە ئاوێتەبوونی ئەم هەوێنی ئاوازانەی ناو هەناوی واژەکانی ئەم دیالێکتە، لەگەڵ ئەو هەموو ئاماژە جوانانەی مەولەوی دا بۆ موزیک و گۆرانی، ئەوەندەی تر جوانیی و شیرینیی بە شیعری مەولەوی بەخشیوە و بە هەردووکیان شیعری (مەولەوی)یان پڕ کردووە لە ترپە و تاڤگە و شەپۆلی لە بن نەهاتووی ئاوازی موزیکی شیعر.

بۆ گەڕان بە شوێن هۆیەکانی ئەم تایبەتمەندیی و جیاوازییەی شیعری مەولەوی دا، کە ئێمە مەبەستمانە و بریتییە لە ڕەگەزی موزیک و گۆرانی، با لە سەرەتاوە بە شوێن کەرەسەکانی ئەم ڕەگەزەدا بگەڕێین و بەسەریان بکەینەوە.

مەولەوی لە بواری ناوهێنانی موزیکدا، ناوی ئامێرەکانی:دەف، سەمتوور، چەنگ، نەی، ڕوباب، تەموورە، کەمانچە، تار، چل چەنگ... دێنێ، کە وەک دەزانین هەندێ لەم ئامێرانە لەسەردەمی ڕمێن و برەوی ئایینی (زەرتوشت) لە کوردستان دا بە کاربراون، بە تایبەتیش:چەنگ، چل چەنگ، سەمتوور، کە بێگومان (مەولەوی)ش لەگەڵ ئێمەدا ئەم ڕاستییە دەزانێ، بۆیە هەر لە موزیکژەنانی ڕۆژگاری دەوڵەتی ساسانی (٢٢٧ ـ ٦٣٣ز)، کە پەیڕەوی ئایینی زەرتوتشیان کردووە، ناوی بەنامێترین جووتە موزیکژەنی وەک نەکیسا و باربەد دێنێ:



**کەف بدە لە دەف، پەنجەت لە رووی نەی**
**وێنەی باربەد، بەزم ئارای کەی**
**نەکیسا ئاسا، دەس دەر وە سەمتوور**
**دەف و نەی و چەنگ، باوەر وە حزوور**١

بەڵام ئایینی زەرتوشت، تا هاتنی ئایینی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی بە ناو کوردستان (٦٥١ز)دا، پەیڕەوکراوە و دواتر کە هەر لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئایینی ئیسلامەوە، دەوڵەتی ساسانی لەناوبراوە، ئیتر زۆر لە ڕیبەران و مووغەکانی ئایینی زەرتوشتی، خۆیان لە ناوچە سەختەکانی هەورامان دا قایمکردووە و دوای تێپەڕبوونی ڕۆژگارێکی درێژ، ئاڵوگۆڕیان بەسەر ئایینی زەرتوشت دا هێناوە و ئایینێکی تریان لێ پێکهێناوە، کە بە ئایینی ئەهلی هەق = یارسان ناسراوە و بەرنامە و ڕێسای ئایینەکەیشیان، لە کتێبێکی تایبەت بەم ئایینە، بە زمانی کوردی (دیالیکتی گۆران و کرمانجی خوارووی)، بە ناوی سەرئەنجام، بە شیعری دوو بەیتیی (مەسنەوی) داناوە، کە کێشی شیعرە دوو بەیتییەکانی سەرئەنجام بریتییە لە کێشی پەنجە = هیجا و دواتریش سەرلەبەری شاعیرانی دیالیکتی گۆران، هەر بە هەمان کێش شیعریان نووسیوە . ٢

ئەوەی ئێمە سەبارەت بەم ئایینەی ئەهلی هەق = یارسان مەبەستمانە و وەک میراتگرێکی ئایینی زەرتووشت هاتە کایەوە و لە ناوچەکانی هەوراماندا سەری هەڵداو دواتر لە هەرێمەکانی کرماشان و لوڕستاندا بڵاوبۆوە و وتیشمان پەیڕەوکارانی ئەم ئایینەش، وەک ئایینی زەرتوشت، ئامێری (موزیک)یان لە سرووتو ترادیسیۆنەکانی خواپەرستیی خۆیاندا، تێکەڵ ڕاز و سکاڵایان دەکرد، بۆیە لای ئەمانیش موزیک بووە هەوێن و کۆڵەگەیەکی پیرۆزی پێکهاتەی ئایینەکەیان.

بەڵام مەولەوی تاوەگۆزی، لەگەڵ ئەوەشدا، کە بە زێد و جوگرافیا و (شێوەزار)یش، لەناوجەرگەی قەڵەمڕەوی پێڕەوانی ئەم ئایینەی (ئەهلی هەق = یارسان)یشدا، نییە و وەک موسڵمانێکی بیروباوەڕ قایم و تۆکمە و پەیڕەوکار و تەنانەت خەلیفەیەکی بەرجەستە و درەوشاوەی ڕێبازی نەقشبەندی، سەر بە ڕابەری ناسراو: شێخ عوسمانی تەوێڵە: شێخی سیراجەددین (١٧٨٠ـ ١٨٦٦ز) و زانیاریی و شارەزاییەکی زۆریشی لە فیقهی ئیسلامیدا هەیە و چەندان کتێبی وەک: العقیده المرضیه و الفضلیه و ...هەیە، کەچی دڵبەستەبوون و سەراسیمە بوونێکی سەیر و ئاشکرای بە بنەما و گەلێ لایەنی ئەم ئایینە(ئەهلی هەق)وە هەیە، کە هیماکانی ئەم سەراسیمەیی و دڵبەستەبوونەی بەم لایەنانەوە، لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە،

وەک ئەوەی لایەنێکی بنەڕەتیی و بەرچاوی ئەم ئایینە، بڕوای بە جێگەگۆڕکێی(رۆح = گیان) هەیە، لە جەستەیەکی مردووەوە، بۆ جەستەیەکی تازە لە دایکبووی زیندوو، واتە: (تناسخ٣ )، یان: (دۆنادۆن)هەیە و ماناشیان بە روونیی ئەمەیە کە هەموو بوونەوەر و ئەفرێنراوەکانی ئەم گەردوونە، رۆحیان لەبەردایە و ئەم (رۆح)ەش، نامرێ و دوای مردنی جەستەیان، دووبارە و سەرلەنوێ رۆحیان لە کات و سەردەمی تردا، بەبەر جەستەی تردا دەکرێتەوە و ئەوەندەش پێوەندی بە مرۆڤەوە هەبێ، ئەگەر مرۆڤەکە چاک و پاک بێت، ئەوا رۆحی بەبەر جەستەی گیانلەبەر و مرۆڤی چاک و پاکی دواتردا دەکرێتەوە و پێچەوانەکەشی، هەروا دەکەوێتەوە.

مەولەوی لە هەندێ شیعریدا، ئاوڕی لە فەلسەفەی ئەم ئایینە داوەتەوە، وەک نموونەی ئەم دوو پارچە شیعرەی کە لە هەردوو شیعرەکەدا، لە زمانی پارچە شووشەیەکی شکاوەوە بۆ مەولەوی دەدوێن و چیرۆکی رۆحی بە (تناسخ) بووی خۆیان، بۆ مەولەوی دەگێڕنەوە، کە چۆن لە پارچە بەردێکەوە، بوونەتە شووشە و دواتریش کراونەتە پەرداخ (لێوان)، کە ئەمە سەرەتا و چەند بەیتێکی هەریەکە لەو دوو شیعرەیە*:

(١)

**روێ فکر بەخت سیایی وێم مەکەرد:**
**پەی چێش هەر پەستیی پەرێ من ئاوەرد !**
**یاران گشت کەیف وەش، سەفا فراوان**
**یەک یەک وە ئەعلای مەقامان یاوان**
**گرد سەرشار مەی، لەقا نماوە**
**هەر من بەستەی خاک، چەم ئەو دماوە**
**جەو فکرەدا بیم، یەک هاودەرد وێم**
**رێزە بلووریٚ قەدیمش دا پێم**
**ئاماوە جواو، رێزەی قەدیم ساڵ**
**بە زوبان حاڵ فەسیح تەر جەقاڵ**
**وات:من سەنگێ بیم، کەفتەی هەواران**
**بێ قەدر و قیمەت، ناڕەوای شاران ٤**

(٢)

**نەتیـــجەی پاک دین، شێخ سازانی**
**خـــاس وەتەن نەدڵ (مەعدووم) سازانی**
**پەرســـام حسب الامر، گوزەشتەی ئەحواڵ**
**جـــواو دا رێزەی شیـشـــەی قەدیم ساڵ**

**زەرفێ بیـــم، نـــەتۆی وەخت شامەوە**
**چـــون ستـــارەی سوبح،مەدرەوشامەوە**
**پەی گوڵاو پاشیی و نەشئەی بەزم (کەی)**
**گا پڕ گوڵاو بیم، گا سەرشار مەی ٥**

جگە لەم لایەنە، مەولەوی لایەنێکی تری شانازیی پێڕەوانی ئایینی (ئەهلی هەق = یارسان)ی بەسەرکردۆتەوە، کە شانازیکردنیانە بە رابەرانی گەورە و کۆچکردووی خۆیانەوە. یەکێکیش لەو رابەرانەیان، کە لەپلەی (فریشتەی حەوتەوانە)دا، دایدەنێن (باوەیادگار)ە .

(باوەیادگار)، نازناوی ئایینی (سەیید ئەحمەدی عەلەوی بەرزنجی سەرانەیی)یە، کە لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە و ساڵی (٧٩٥ک ــ ١٣٩٢ز)، بە دەستی لەشکری تەیمووری لەنگ کوژراوە و لای پێڕەوانی ئایینی ئەهلی هەق، یەکێکە لە فریشتەکانی (هەفتەن)، یان (حەوتەوانە) و گڵکۆیەکەی لەسەر چیای (داڵەهۆ)ی (سەرانە)یە و مەزاری پیرۆزی ئەهلی هەقەکانە ٦.

بۆ ئەوەش خوێنەری هێژا هەندێک زانیاریی لە بارەی (فریشتەکانی حەتەوانە)ی ئایینی (ئەهلی هەق)ەوە هەبێ، دەبێ بڵێین: بنەمای سەرەکی لە سیستەمی ئایینی (ئەهلی هەق) دا، بریتییە لە باوەڕبوون بە دەرکەوتنی یەک لە دوای یەک(بەرودوا)ی خودایەتی (Divinite) ، یان (پاشای جیهان)، کە هەر وەکو خۆی دەمینێتەوە و تەنیا (پۆشاکەکانی)، یان:(دۆن = don)ەکانی، یەک لە دووی یەک دەگۆڕدرێن و دەتوانین هەندێ لەوانە بژمێرین:

یەکەمین دەورە:Cycle، دەورەی ئەزەلە:Pretemite، ئەوەی خاوەندگار، کە چوار فریشتەی لە دەوورە: جوبرایل، میکایل، ئیسرائیل و عیزرائیل.

دووەمین دەورە: ئەوەی مورتەزا عەلی = عەلی ـ چوارەمین خەلیفەی ئیسلام)یە، کە فریشتەکانی بریتین لە: دەستەیەک لە موسڵمانانی ناسراو:سەلمان، قەمبەر، محەمەد، نۆچیر و دواتریش فاتیمە.

وەک سەرنج دەدەین لەم دەورەیەدا شوێن و پلە و پایەی مەزنایەتیی (عەلی) دەردەکەوێ، کە لە پلەی یەکەمیانە.

سێیەمین دەورە: بریتییە لە دەورەی (شاخوشین)، فریشتەکانیشی بریتین لە: بابا تاهیری هەمەدانی



(شاعیر)، بابا بوزرگ، کاکە ڕەزا، کوڕیٚ فەقیٚ و مامەد جەلال.

چوارەمین دەورە: بریتییە لە: دەورەی سوڵتان (سوهاک)، بەیاوەریی:بنامین، داوود، پیرمووسیٚ، مستەفا داوودان، خاتوون دایریٚ، کە هەندیٚ جاریش (خاتوون ڕەزبار)، یان: (دایە ڕیٚزبار = دایە ڕەمزیار) شویٚنی دەگریٚتەوە.

هەڵبەتە هەر یەک لەم فریشتانە، ڕۆڵی تایبەتی خۆیان هەیە و بەپیٚی پرنسیپەکانی ئەهلی هەق دیاری کراون، کە وردەکارییەکانی ئەو پرەنسیب و زانیارییانە، بۆ ئەم بابەتەی ئیٚمە، لە مەبەستمان دوور دەخاتەوە، بۆیە دەگەڕیٚمەوە بۆ کرۆکی مەبەستەکەمان و دەڵیٚم: مەولەوی شیعریٚکی زۆر بە کوڵ و بە سۆزی لەسەر گۆڕی (باوەیادگار) و بۆ خودی (باوەیادگار) نووسیوە ، کە ناوەڕۆکی شیعرەکەی مەولەوی، ئەوەندە زانیاریی قووڵی لەبارەی پلەو پایەی (باوەیادگار) و (دۆنادۆن) و (حەوتەوانە) و هەندیٚ لە فریشتەکانی حەوتەوانە و بە تایبەتیش (عەلی: مورتەزا عەلی) تیٚدایە، کە نیشانەی پاشخانیٚکی زۆر شارەزایانەی (مەولەوی)یە، لە بارەی ئەهلی هەقەوە. لەبەرئەوە ئاوەڕدانەوەی مەولەوی لە (باوەیادگار) و بەسەرکردنەوەی ئەم کەسایەتییە مەزنەی ئەهلی هەق، لەلایەن (مەولەوی)یەوە، لەلایەکەوە ئاوەڕدانەوەیەکی ئەوپەڕی هۆشیارانەی مەولەوی یە لەم ئایینە کوردییە و لەلایەکی تریشەوە کرانەوە و دیالۆگیٚکی خویٚندەوارانەی تاقانە شاعیٚریٚکی موسڵمانە، لەگەڵ ئایینیٚکی تری نەتەوەکەی خۆیدا، کە ئەمە نەک هەر بۆ شاعیٚریٚکی موسڵمانی ئەو سەردەمە، بەڵکو بۆ نزیکەی (١٥٠) ساڵ زیاتر بەر لە ئیٚستا، زۆر ئەستەم بووە، کە وەک دەزانین ئەم ئایینە لەلایەن زۆر لە موسڵمانانی بیرتەسک و دەمار گرژ و تەنانەت خویٚندەواران و شاعیٚرانیشەوە دژایەتی کراوە و تانە و تەشەری زۆریان لیٚدراوە.خۆ ئەگەر لەم بۆنەیەدا ئەو شیعرەی شاعیری گەورە: شیٚخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣١ ـ ١٩١٠ز)مان بە یاد بیٚتەوە، کە لەهەمان ڕۆژگاری ئەم شیعرەی مەولەوی دا، دژی پیٚڕەوانی ئەهلی هەق (کاکەیی) نووسیویەتی و چ سووکایەتییەکی بە پیرۆزییەکانی ئەم ئایینە










کردووە٧ ، یان شاعیریٚکی سەر بەهەمان (ڕیٚباز و شیٚخ و پیر) ی مەولەوی، وەک (مەحوی: ١٨٣٢–١٩٠٦ز)، کە توانج و سووکایەتیی بە یەکیٚک لە ڕەمزە پیرۆزەکانی پیٚڕەوانی ئەهلی هەق، واتە : (دایە ڕیٚزبار) دەکات ٨، ئەوسا دەزانین کە ئەم شیعرەی مەولەوی، لەو ڕۆژگارەدا و بگرە بۆ ئیٚستاش، وەڕسوڕانیٚکی چەند نویٚیە لەم بوارەدا، چونکە ئەم شیعرەی مەولەوی بۆ (باوەیادگار). هەروا ڕووداویٚکی شیعریی و بیرۆکەیەکی سۆزداریی و ڕاگوزارییانە نییە، بە تایبەتی کە وەک لەناوەڕۆکی شیعرەکەدا دەردەکەویٚ، مەولەوی لە تەمەنیٚکی تەواو کامڵ و پیٚگەیشتوودا لەگەڵا ڕۆحی (باوەیادگار)دا دەدویٚ، کە هەر لەم تەمەنی پیریی و کامڵبوونەیدا، نامەیەکی بۆ شیٚخ عەلی حیسامەددین (١٢٧٨ ـ ١٣٥٨ک)ی کوڕی شیٚخ بەهائەدین نووسیوە و ناوەڕۆکی نامەکە لە زۆر ڕووەوە گرنگە و تیایدا زۆر بە شکۆوە داوا لە شیٚخ عەلی حیسامەددین دەکات، تا هاواری (حەزرەتی عەلی) بکات و لە هەمان کاتدا شیٚخ عەلی، لە ڕەمز و جیهانی میتۆلۆگیا نزیک دەکاتەوە:

ناد علیا مضهر العجـــائب
تجده عونا لک فی النوائـب ٩

ئەم ئاماژە کردن و خۆبەستنەوەیەش بە جیهانی

میتۆلۆژیایەوە، ناچێتە خانەی وەرگەڕان لە ڕێبازی ئایینی، بەڵکو بڕوابوونە بە یەکێتی ئایین و یەکێتی ئایینەکان، کە لای زۆربەی سۆفیگەلی گەورە، باو بووە. ئەوانە بە گیانی دەمارگیریی و تەعەسووبەوە سەیری بیروباوەڕی خۆیان نەکردووە. (هادی العلوی) سەبارەت بەم هەڵوێستەی ئەم سۆفییانە و بە تایبەت (أبن العربی) دەنووسێ:
(أن عقیده المسلم و الیهودی و النصرانی سواء)١٠
..گەر کەسێکیش لەم بۆچوونەی (أبن العربی) تێنەگات، قەت ناتوانێ لە (مەولەوی تاوەگوزی) یش تێبگات، کە بۆ:حاجی مەحموود یاروەیس دەنووسێ:
(چه گونه حتی خودم از گبر و یهودی بهتر نمیدانم) ١١
واتە : ئەی چون من خۆم لە گاور و جوولەکە کەمتر نەزانم!؟
زۆرینەی سۆفیگەلی مەزنیش ئەم هەڵوێستەیان بەرامبەر ئایینەکانی تر هەبووە.
لەبەرئەوەش کە شیعرەکەی مەولەوی بۆ باوەیادگار، وردەکاریی و زانیاریی زۆری لەبارەی ئایینی (ئەهلی هەق)ەوە تێدایە، بۆیە پێمان باشە هەموو شیعرەکە بەرچاوی خوێنەران بخەین:

**سەرشـــار صەهبای بەزم موناجات**
**مەلجەی ئیلتیجای ئەرباب حاجات**
**جای رجای جەرگەی پادشا و دەروێش**
**بارەگا و پەنا، پەی بێگانە و خوێش** ١٢
**ئـــاهووی خوتەنیی فەیض ئیلاهی**
**نافـەی ناف راهی، جەمەە، تا ماهی**
**شکۆفەی وەش بۆی ڕەیحانەی ڕەسوول**
**نەوباوەی نەمام، گە یبە ی (بەتوول)**
**ســـەرو سایەدار، نیشانەی وەلی**
**یەعـــــنی یادگار: مورتەزا عەلی**
**وە ڕەوزەتانا هەر نوور واران بۆ**
**تا دەفع زوڵمەت، دیدەی یاران بۆ**
**هـەوای ســایەتان، هەر مەمدوود مانۆ**
**سەبوون بوردەی جورم، نەک زەرەر سانۆ**
**ناپوختەکاریی و شەرمەساریی من**
**خەجڵەت غەفڵەت، گوناهکاریی من**
**کەفتەن وە هەمدا، یەند زۆر ئاوەردەن**
**ڕووی ڕجام، وە پای بارەگات کەردەن**
**تۆ چون جە ئەولاد ئەمجاد مەولای**
**پەی ڕجا وەجا، پەی هیممەت ئەولای**
**زاری و زکاریی و زویریی کەردم**
**وە بارگەی پاکت پەنا ئاوەردم**
**ئامام، سەر نیام وە بارەگاوە**
**غەریو، موو سفید، وە رووی سیاوە**
**تەن:مەعصییەت بار، دەروون:پڕ جە دەرد**
**دیدە: تەڕ، لەب: خوشک، دڵ: گەرم نەفەس: سەرد**
**های چەنڎ پلەی سەخت، هانە ڕێمەدا**
**جە ڕووی ئیلتیفات، بدیە پێمەدا**
**بەڵکم جە ڕووی ئەو ئیلتفاتەوە**
**مەولام حازڕ بۆ، وە نەجاتەوە**
**دەس شای مەردان، مەدەد کارم بۆ**
**پلە:ئەو پلە، ئەو:دەس وارم بۆ**
**مە عصییەت نییەن، چون هیچ صەدمەتێ**
**خەیلێ مەلوولم، یا پیر! هیممەتێ**
**هیممەتت باعیپ رستگاری بۆ**
**یار بۆ، دیار بۆ، یادگاری بۆ** ١٣

وەک پێشتریش وتمان:مەزار و بارەگای (باوەیادگار)، لەسەر چیای (داڵەهۆ)یە و ئەم زنجیرە چیایەش، زۆر لە زێد و جوگرافیای مەولەوی، واتە:لە ناوچەی (تاوەگۆزی)یەوە دوورە و بۆ تەمەنێکی پیر و بە ساڵاچووی وەک (مەولەوی) یش، کە خۆی لەم شیعرەدا، باسی (ڕیشی سپی) خۆی کردووە، دەبێ دوای ماندووبوونێکی زۆر دژوار، توانیبێتی زیارەتی گڵکۆی (باوەیادگار)، لەسەر کێوی زۆر بەرزی(داڵەهۆ) بکات.. کەچی وەک لە نموونەی شیعری تری مەولەوی دا دەبینین: مەولەوی ئەوینێکی قووڵی لەگەڵ شوێنە پیرۆز و مەزارە گرنگەکانی ئایینی (ئەهلی هەق)دا هەبووە و وەک لەو نموونە شیعرییانەیدا بە دیاردەکەوێ، مەولەوی نەک هەر تەنیا خۆشی ویستوون و زیارەتی زۆرینەیانی کردووە، بەڵکو شیعریشی بۆ وتوون.
زۆرترین و گرنگترین شوێنە پیرۆز و زیارەتگەکانی ئایینی ئەهلی هەق، لە ناوچە شیرین و جوان و لەهەمانکاتدا، زۆر سەختەکانی (ڕێژاو) دان و لە نزیک و دەوری گوندی (ڕێژاو)یش، چەند گوندێکی دڵگیر هەن وەک:زەردە، یاران، پیران، .. لەناو ئەمانەدا گوندی (زەردە)، وەک قیبلەی پیرەوانی ئەهلی هەقە و بە درێژایی ڕۆژانی هەفتە، ڕێچکەی زیارەتکاران، دەستە دەستە، سەردانی دەکەن.
مەولەوی ناوی ئەو چەند گوندەی بە جۆرێک لە بەیتە شیعرێکیدا گونجاندوون، وەک ئەوەی



هەریەکەیان بەشێک بن لە ئەندامەکانی جەستەی خۆی و دیدەکانی و فرمێسکی چاوی و روخساری خۆی:

**دیدەم:(ڕێژاو)ە، روخسارم:(زەردە)ن**
**جە داخ:(یاران)، (پیران)م کەردەن** ١٤

هەر لە بواری ناوهێنانی ئەو ڕەگەزانەی لای پێڕەوانی ئایینی (ئەهلی هەق)، زۆر پیرۆز و گرنگن، مەولەوی ناوی سەرەکیترین ئامێری موزیکیی ئەهلی هەق دێنێ، کە ئامێری (تەموورە) یە و هەوێن و بنەمای ئایینی ئەهلی هەقە و هەموو بۆنە و سرووتگەلی ئایینی و کۆمەڵایەتییان، لە ماڵ و لە(جەمخانە)کانیاندا، هەر بە ئامێری (تەموور)ەوە ئەنجام دەدەن و بە هەمان ئەو ناوەشەوە، ناوی دێنێ، کە ئێستا خودی پێڕەوانی ئەهلی هەق، هەر پێی دەڵێن:
تەموورە١٥

**لوولەی تەراویح، وەش وەش مدۆ دەنــگ**
**بێ ئاهەنگەن (تار)، (تەموورە)ی ئاهەنگ**
ل٣٩٤

ئەم پەنجەرە کردنەوە و ئاسۆ بەرین روانینەی مەولەوی تازەگۆزی، بۆ ئایینەکانی تری جیا لە ئایینی ئیسلام و بۆ جوگرافیایەکی فراوانتر لە جوگرافیای زێدی خۆی و ئەو هەموو گەڕان و سەردانە بەربڵاوانەی مەولەوی، لەو هەرێمە بەرینەدا، گەلێ تیرۆژی رووناک و پرشنگداریان لەسەر شیعری مەولەوی کردۆتەوە و فەرهەنگی واژەگەلی شیعری (مەولەوی)یان دەوڵەمەندتر کردووە و لە هەمانکاتدا لە خەم و خۆزگەی جەماوەرێکی فراوانتریش نزیک بۆتەوە، کە زۆرینەی ئەو جەماوەرە بە گشتی و جەماوەری پیڕەوانی (ئەهلی هەق) بە تایبەتی، کە لە دێرزەمانەوە (لەبەر زۆرهۆ، کە ئێرە جێی نییە) تەنگیان پێ هەڵدەچنرا و پەراوێز دەخران و دەچەوسێنرانەوە، کاتێ دەیانزانی هەندێ لە پیرۆزیی و سەروەرییە گەمارۆدراوەکانی خۆیان لە شیعری مەولەوی دا دەبینییەوە، هەستیان بە بەسەرکردنەوە و نیمچە ئابلووقە لەسەر لابردن و ڕێزلێنان و شانازیی بەخۆوە کردنەوە دەکرد و باوەشی ڕێز و گەرمیان بۆ شیعرەکانی مەولەوی دەکردەوە و وەک خۆراکێکی گیانیی بۆ شیعری (مەولەوی)یان دەنواڕی. لەم رووەوە هێشتا مەولەوی خۆی لە ژیاندا بووە ، کە لە کۆڕ و کۆمەڵ و قەڵەمڕەوی خۆیاندا، رمێن و برەویان بە شیعری مەولەوی دەدا و هەندێ جاریش (تاکە بەیت) و هەندێ شیعریان دەکردنە سۆز و سروود و لە مەقامی بەناوبانگی (قەتار = گاتا)ی تایبەت بە پێڕەوانی (ئەهلی هەق)دا جێگەیان دەکردنەوە (کە تا ئێستاش ئەم نەریتە هەر بەردەوامە)١٦ و هەموو ئەمانەش وایان دەکرد بە چاوێکی تایبەتی و ڕێزەوە، بۆ خودی (مەولەوی) بنواڕن، کە نووسەری ئەم دێرانە، لە زۆر لەو سەردانە مەیدانییانەی خۆمدا، بۆ ناوچەکانی ئەهلی هەق ١٧ و دیدارم لەگەڵ پێڕەوانی ئەهلی هەق دا، هەمیشە ڕاستەوخۆ سەبارەت بە (مەولەوی)، لێم بیستوون، کە پلەوپایەی مەولەوی و تەنانەت (عەنبەرخاتوون)ی هاوسەریشی، وەک بەشێک لە خۆیان ئەژمار دەکەن و بە پێودانی ئەو نازناوی (باوە)یەی بۆ رابەرەکانی خۆیانی دادەنێن، بە (مەولەوی)یش دەڵێن: باوە مەولەوی و بە (عەنبەر خاتوون)یش دەڵێن:دایە عەنبەر!.

(٢)

بەڵام وەک پێشتر وتمان ئەو ئامێرانەی موزیک، کە مەولەوی ناویان دێنێ، بە تایبەتیش:چەنگ، چل چەنگ، کەمان سەمتوور، تار...کەمتر لە سنووری جوگرافیای پێڕەوانی ئەهلی هەق و خودی ناوچەکەی مەولەوی (جوانڕۆ)شدا بەکار دەبرێن و زۆرتر لە رۆژگاری دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانی و زۆر پێشتریشدا بەکاربراون، بەواتایەکی تر: زانیارییەکانی مەولەوی لەسەر موزیک و ئامێرەکانی موزیک، هەر تەنیا لە ڕێگەی ئەو خۆشەویستیی و دۆستایەتییەوە نەبووە، کە لەگەڵ پێڕەوانی ئەهلی هەق و موزیکەکەیاندا هەیبووە، چونکە (وەک پێشتر وتمان) ئەو ئامێرە موزیکەی کە ئێستا پێڕەوانی ئەهلی هەق بە شێوەیەکی گشتی، زۆر لایان پیرۆزە و لە جەمخانە و لە ماڵەکانی خۆیاندا، بۆ دەربڕینی راز و سۆز و سکاڵای ئایینیان بەکاری دەبەن، زۆرتر هەر ئامێری (تەموورە = تەمیرە)یە، کە هەر بە تەنیا دەژەندرێ و بە دەمیشییەوە کەڵام = شیعر دەخوێندرێ. لە کاتێکدا ئەو چەند ئامێرە موزیکەی پێشتر ناومان هێنان، مەولەوی بە



جۆرێک باسیان دەکات، کە هەندێ جار سێ، تا چوار ئامێر پێکەوە و وەک تیپێکی موزیک، لە کۆڕ و کۆنسێرتێکی موزیکیدا بەشداربن:

(١)

**شیعر وێم تەنخوای (سەمتوور) ســـازێ**
**لێدەر سا (نەیچی)! هەر ئاریش گـــازێ**
**چنگ پێکۆ نە جەرگ نەغمەی ســـازەکەت**
**بەرارۆ تۆتۆ، میقراز گازەکـــــەت**
**سا دەرویش! کـــەفێ بدە نە رووی (دەف)**
**گیان مونتەزیرەن پەرێ رێـــزەی دەف**
**(موغەننی) ! لێدەر، یەک ئیمشەو سازان**
**بەشقی ئەو کەسە، تۆش ئـــاوات وازان ١٨**

واتە:ئەی شمشاڵژەن! شیعرەکانی خۆم لە باتی ئامێری سەمتوور، بە شمشاڵ بژەنە! با هەر ژێیەکی (سەمتوور)ەکە، وەکو گازێک وابێ، بۆ دەرکێشانی ریشەی جەرگم و نەغمەی سازەکەت ، چنگ لە جەرگم گیر بکات و چین چین وەک گازی مقەست، دەری کێشێ.

دەرویش! تۆش لەپی دەستت بۆ (دەف)ەکەت ببە و رۆحم چاوەنواڕی لەرینەوەی ئەو ئەڵقانەن، کە بە کەمەی دەفەکەوەن.

تۆش ئەی گۆرانیبێژ (موغەننی) ! ئیمشەو ئاهەنگێکمان بۆ ساز بکە، چونکە ئەوینی من، بۆ کەسێکە، بە ئاواتی گۆرانی وتنی تۆوەیە.

(٢)

**موغەننی! کۆکەر: سازانت وە هـــەم**
**(سەمتوور)ێ، (تار)ێ، وە هەم کەرە جەم**
**(نەیچی)! سا لێدەر، قەزات وە ماڵـــم**
**دەمێ دەر وە (نەی)، دەروون زوخاڵـــم**
**هۆشێ دەر، هام فەرد! سازان بســـازە**
**باڵات وە کاڵای خەمــــــان بوورازە**
**باوەرە، بســـات تەمـــــام تەیارکە**
**شەوخەفتەن شووم، بەژار مارکــــە**
**قەزای پەنجەکەت دەک لـــەمن کەفێ**
**خەیلێ عاجزم، ســـا لێدەر:(دەف)ێ ١٩**

واتە:ئەی گۆرانیبێژ! ئامێرەکانی موزیکات:(سەمتوور) و (تار)ەکەت، بخەرە تەک یەک و تۆش ئەی شمشاڵژەن! دەردت لە ماڵم بکەوێ، دەم بە شمشاڵەکەتەوە بنێ، سووتاوم و خەریکم ببم بە خەڵووز، هۆش بەبەر خۆتدا بێنەوە و ئامێرەکانی موزیک، بۆ بەکارهێنان لە پاڵ یەکدا دابنێ و ئامادەی بەکارهێنانیان ببە و باڵات لەگەڵ کاڵای خەم بەیەکەوە بدوورەوە. پێویستی و کەرەسەکانی رابواردن ئامادە بکە و خەوم لێ بزڕێنە، با ئەم خەوە شوومە ، بەرم بدات و بە ئاوازی دەفەکەت، دڵ بە جۆش بێت.

(٣)

**ئاوازەی مەینەت، نە دەروون ســـەد تەرز**
**چون (چل چەنگ) وە چنگ، خەمان بییەن بـەرز**
**بێهۆشیی جەهۆش، کــــەم فامیی جە فـام**
**وە هەزار مەقام، مـــــــدەران جەفـام**
**سا (نەیچی)! دەخیل، بێ دێر و درەنـــگ**
**موتریب! فیدات بام، (نەی) باوەر وە دەنـگ**
**کەف بدە نە (دەف)، پەنجەت نەڕووی (نـەی)**
**وێنەی (باربەد)، بەزم ئارای (کـــەی)**
**(نەکیسا) ئاسا، دەس دەر وە (ســــەمتوور)**
**(دەف) و (نەی) و (چەنگ)، باوەر وە حـــزوور**
**(چل چەنگ) نەسەر چەنگ، پەنجەت دەر قـەرار**
**وە هەزار دەسان، بنوازم ئەمجــــــار**
**وێت بە حەقیقەت، مەست بکەر جە مـــەی**
**سازان بســـــازە، پەی واوەیلای وەی**
**کەف بدەر نە (دەف)، (چەنـگ) باوەر وە نەی**
**هیچ مەواچۆ:کەی! توخودا ســــادەی**
**بەو ئاواز بەرز، خاس بکــــەر رازان**
**بە عەشق ئازیز، نـــازک ئەندازان ٢٠**

واتە:ئاوازی کوێرەوەریی لە دەروونمدا، بەسەد جۆر سەریان هەڵداوە و وەک دەنگی چل چەنگ، دەنگی (خەم)م لێ بەرز دەبێتەوە و بێهۆشیی لە هۆشمدا و کاڵ و کرچیم وەک دەنگی ئەو (مەقام)ە بە سۆزانەی دڵ لەت لەت دەکەن، بە هەزار جۆر مەقام، ئازارم دەدەن. لەبەرئەوە کاکی شمشاڵژەن! خێراکە شمشاڵەکەت بژەنە و تۆش کاکی گۆرانیبێژ! دەستم دامێنت، تۆش هەر خێراکە، بە قوربانتان بم، تۆش ئەی دەفژەن و گۆرانیبێژ و شمشاڵژەن! هەروەک (باربەد) و (نەکیسا) ی جووتە موزیکژەنی بەناوبانگی سەردەمی ساسانی، کە بەزم و ئاهەنگیان بۆ کەیخوسرەو ساز دەکرد و موزیک و (سەمتوور)یان دەژەند، دەست بۆ (سەمتوور)ەکەت ببە و بە هەمووتان ئامێرەکانی:دەف و نەی و چەنگ و چل چەنگ و سەمتوور بهێننە مەیدانەوە و دەستەکانتان بکەن بە هەزار دەست و سازەکانتان بژەنن و هەرگیزیش



**خاڵی یەکەم:** سروشت بخرێتە نێو چوارچێوەی ئەدەبەوە.

مەولەوی بە جوانی ئەم کارەی ئەنجام داوە لە تافی بەرزی هونەردا ڕایگرتووە. دەبینین جگە لەوەی شیعری گەورەی بۆ هەر چوار وەرزەکەی ساڵ هەیە و گەلێکی زۆر وێنەی جوانی بەکامێرای هزر لێگرتوون، چەندین شیعریشی کە بۆ شێخەکەی یا هاوڕێکانی یا لاواندنەوە نووسیونی، کەچی تێیاندا تابلۆی جوانی سروشتی تێهەڵکێش کردوون. شیعر نووسین بۆ بەهاری سەوز پۆش و پایزی ڕەنگا و ڕەنگ هیچ کاتێ بە ئەندازەی ئەوە هونەریان تێدا نییە کە شیعر بۆ هاوینی وشک و برینگ و زستانی تووش و کڕێوە بنووسرێ. لەبەرئەوە خۆمان لادەدەین لەو شیعرانەی کە بۆ بەهار و پایزی نووسیون. ئەمە نموونەی تابلۆیەکی بۆ زستان.

**زوسانەن وەی ڕەنگ وە گەردوون پاوان**
**گێجیای لوول گێچ کلێڵەی کاوان**
**بە ناباشی بورج بەرزە دیاران**
**سفیدکاری کەرد تاقچەی موغاران**
**چ شرین زەڕگەر تۆفی هەوای سەرد**
**گۆشوارە نەگۆشی نەونەمامان کەرد**
**پەی دیەن باڵای مەحبووبی بێگەرد**
**یەخ ئایینەگرت، ئەم چارشێو ئاوەرد.**
**دیوان ل** 278

ئەمەش نموونەیەک لەسەر وەرزی هاوین.

**هامن، هامن وار گەرمیش جۆش ئاوەرد**
**فەزای بەزم نەزم نەوگوڵاڵان بەرد**
**بووڵ وەیانەی جەم نەوگوڵاڵان شەند**
**چەمەن بێ نەوای ناڵەی بولبول مەند**
**تای بەڕەزای شەنگ فەسای موغاران**
**شێوناْ چون زوڵف تەعزییە داران**
**ها، کاوان، کاوان دڵ چون دڵڕێشان**
**هەڕ دان وەسەردا پەی وێشان**
**دووریێت ئایروست وە یانەکەی من**
**یانی یانەی دڵ وێرانەکەی من**

**هەوا ئایریین، سەرووەخت ئایریین**
**دڵە ئایریین، بەدبەخت ئایریین**
**وەی گشت ئایرەوە خەیاڵم خامەن**
**بەختم ناپوختەن فامم نەفامەن**
**وەی پڵێسەوە گەردم باقییەن**
**وادەی ئایریین بادەی ساقییەن**
**بەشقی پییاڵەی مەستی چاوەکەت**
**بەو پەشێویی چین پای کڵاوەکەت**
**بابەی مەی بەڵکم ئایری مەستی ی**
**سۆچنۆ یەکسەر خاشاکی هەستی ی. ل** 522

**خاڵی دووەم:** هەموو بابەتێکی ئەدەب بۆ ژیان دەست دەدات.

لەمبارەیەوە کە دیوانی شاعیری ئەم باسەمان دەخوێنینەوە، دەبینین دیوانەکەی فرە بابەتە. وەکو: ڕێزگرتن و پیاهەڵدانی گەورە پیاوان، سروشتی کوردستان بەگەرمیان و کوێستانەوە، نامەی شیعریی، تەسەوف، شینگێڕی، زانستەکانی سەردەمی خۆی، هزر و ئایدیا، شیعری ئیسلامیانە لەشێوەی موناجات و باسی ڕەمەزان و میعراج، هەندێک شیعری داشۆرین.

**خاڵی سێیەم:** پیشاندانی گرفت و خەوشەکانی ناو کۆمەڵگا.

لەخوێندنەوەی دیوانەکەی ئەم پاشا شاعیرەماندا بەشێوەیەکی فراوان ئەوە دەبینین کە زۆرتر دەستی لەسەر جوانییەکانی کورد و کوردستان داناوە. بەڵام هەندێ جاریش لەشێوەی داشۆریندا دەستی خستۆتە سەر دیاردە و کەسە دزێوەکانی ناو کۆمەڵگا. بۆ نموونە ئەم بەیتانە بەسەر دەکەینەوە.

* **دزەکەی زەهاو زاوو زۆ کەردن**
**هەر دزێ حەو دز پەی وێش ئاوەردەن. ل**254

* **من جەخێڵخانەی مەینەت پامالْم**
**کۆن بەینەت داریْ پەرسۆ ئەحوالم. ل** 130.

* **ئەوسا ئەزانام بەختەکەم شەڕبی**
**عێلەکەم هامڕای عێلی سە گوەڕبی. ل** 59



* **ئەرزە لیلی دەست (بێ شەرتان) نەبوون**
**کەی مەبۆ مەیلت فەرامۆش کەروون؟ ل 19**
* **جەبێ کەسی وێم تۆم کەردەن وە کەس**
**نە بەکەس شیای نە بەنیمە کەس. ل 158**

**خاڵی چوارەم:** هێنانە ناوەوەی چەند ڕێگەیەکی زانستی بۆ ناو ئەدەب.
لەم ڕووەوە مەولەوی بەشێوەی هونەری بەرز هەندێ لە زانستەکانی ڕۆژگاری خۆی کردۆتە شیعر و لەم بوارەشدا گرەوی خۆی بردۆتەوە. بەرهەمەکانیشی بریتین لە:
1– العقیده المرضیة بەشێوەزاری جاف کە داگری 2452 بەیتە شیعرە.
2– الفظیله بەزمانی عەرەبی 2031 بەیتە.
3– الفوائح بەزمانی فارسی 527 بەیتە
دیارە ناتۆرالیزمەکان بۆ زانست مەبەستیان زانستی نوێیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە مەولەویش زانستی شیعر پڕێن کردووە، ئیتر زانستی کلاسیکیش بووبێ هیچ لەوە ناگۆڕێ کە بەسەرکەوتوویی دەستی بۆ ئەوکارەش بردووە و گرەوی تێدا بردۆتەوە و هەر ئەوەشی لەبەردەستدا بووە. لەڕووی بەرهەمی زانستی نوێشەوە، هەندێ شتی دیتوە لەناو شیعردا جێگەی کردوونەتەوە وەک:

**جەزبەی ئاهینم دەماخ دان پەرداخ**
**(میقناتیز) تۆی جام کەردەن وە یاتاخ.**
**ل 452**



**یا: پۆسی کووسی گۆش نم کێشان کەم کەم**
**ئەم سەرەو سەرەن (دووربین)ەکەی چەم.**
**ل 477**

**یا: بێچارە وەتای زوڵفت گیربیەن**
**ها نەپای (تەل)دا جواوش نیەن.**
**ل84**
**تەل = تەلەگراف**

یا لەبارەی زانستی پزیشکییەوە دەڵێ:
**شنەفتم دووربا لەیل زوکامشەن**
**دیشواری باڵای نەونەمامشەن**
**هەنارەکەی دڵ پڕ جە دانەی ئێش**
**پیشیای کوورەی ناری عەشقی وێش**
**بە مەودای موژگان سۆراخش کەرۆ**
**وە گەرمی ی نیشان دەماخش دەرۆ.**
**ل 322.**

واتە: دووربێ بیستوومە یا هەڵامەتیەتی و باڵای تازە هەڵچووی دووچاری گرفتاریی بووە. هەنارەکەی دڵم کە پڕیەتی لە دانەی ئێش و لەناوی تەنووری ئاگری عەشقی خۆیدا بیپیشێنێ، پاشان بە تیغی برژانگی کونی تێبکا و بۆنەکەی هەڵمژێ چاک دەبێتەوە. پزیشکی کلاسیکی.
یا دەڵێ: **ئەر گێروو وەکام کافوورم کەم کەم**
**ئاو قەفاڵی وێش مەپێکۆ دەردەم.**
**ل 452**

واتە: ئەگەر تۆزێ کافوور بگرم بەدەممەوە ئەوەندە گەرم دادێت خێرا خوێنی دەماری پشت ملی بەردەبێ.
**یا: ئەنفیەکەی گەرد رای دەردم هەوا**
**مەکەرۆ دەماخ ئەفلاتوون دەوا.**
**ل452**

"ئەنفیە = برنووتی. تۆز بچێ بە لووتی هەرکەسێکدا لەوانەیە نەخۆشی بخات، تۆزی ڕێگەی دەردی من هەوا دەیکات بە لووتی ئەفلاتوونی حەکیمدا و چارەسەری دەکات" برنووتی: دەرمانێکی کۆنە و بەکارهێنراوە".
ئیتر مەولەوی هەر ئەم زانستانەی کە ناومان بردن لە بەردەستدا بووە و توانیویەتی بیانخاتە چوارچێوەی شیعرەوە، زانستی کلاسیک و نوێ لە دنیادا هەبووە، گرنگ ئەوەیە زانست بە جوانی لە شیعری مەولەویدا ڕەنگی داوەتەوە.
**خاڵی پێنجەم:** ئازادی دەربڕین بە مەبەستی دروستکردنی کۆمەڵگەی کراوە.




ئەم شاعیرەمان بە دڵ و گیان لەگەڵ ڕێبازی نەقشبەندیدا بووە؛ کەچی گوێی لە ناکۆکی نێوان ئەم ڕێبازە و ڕێبازی قادری یا تاڵەبانی خەواندووە، ئەوەتا دەبینین شیعری بۆ شێخ عەبدولڕەحمانی خالسی تاڵەبانی و شێخ حەسەنی مەولاناوی قادری نووسیوە، بگرە بەوەشەوە نەوەستاوە بە پارچە شیعرێکی هەژدە بەیتیی باس لە هیمەت و شکۆمەندی باوە یادگاری یەکەم پیاوی یارسانییەکان – ئەهلی حەق دەکات. واتە پابەندبوون و گیرسانەوەی بە ڕێبازی نەقشبەندییەوە ڕێگەی ئازادی دەربڕینی لێنەگرتووە. بە مەرجێ لەسەروبەندی ژیانی مەولەویدا ئەوە دەزانین کە نەقشی و قادری چەند ناکۆک بوون، چارەنووسی مەولانا خالید و سلێمانی جێ هێشتنی دەزانین، ئەوەشمان لەلایە کە (مەحوی) سەر بە نەقشبەندییەت چەند ئازار دراوە.

**تێپەڕاندن لە ناتۆرالیزمەکان**

شاعیرانی ئەو قوتابخانەیە کە ئاوڕیان لە سروشت داوەتەوە هیچ کامێکیان وەک مەولەوی نەیانتوانیوە وا لەخۆیان بکەن، یا ئەوەندە هۆگری سروشت بن ڕۆحی خۆیان تێکەڵ بە ڕەگەزەکانی سروشت بکەن. واتە مەولەوی هەر ئەوە نییە کە بە کامێرای هزر وێنەی جوانی سروشتی بۆ گرتبین، بەڵکو لە گەلێ شوێندا وەها لەگەڵ ئەو ڕەگەزانەدا دەدوێ دەبێتە ئەندامێک لە سروشت، قسەیان لەگەڵ دا دەکا، دەیانلاوێنێتەوە، فەرمان دەدا بەسەریاندا و ڕێنوێنیان دەکات. لەمبارەیەوە با ئەم بەیتانە بەسەربکەینەوە:

1- **پایز زەڕ، یەخ جام، چارشێوێ هەی تەم**
**دێرەن سوارەن نەو عروسی خەم. ل** 276

2- **نەسیم پەنجەی پات ئەر سەردیی کێشان**
**برارەش نەتۆی دڵ دەروون ڕێشان. ل** 538

3- **ملان، سەربەزان، کۆساران، هەردان**
**بێ شەرتان جەداخ وەفاتان مەردان**
**چێشەن ئارایش سەرتاوەدامان**
**مەوخاڵۆم وەعەزم سەیرتان ئامان. ل** 141

4- **نەسیم بەس بویەر وەکۆساراندا**
**وەسەن شانای وەڵگ وەدیاراندا. ل** 142

5- **مەشنیە چین چین چنوور نەکاوان**
**توخوا ماتەم بەر هاژەی وەفراوان. ل** 141

دیارە نموونەی دیکەش هەن و ئێمە لەگەڵ چڕکردنەوەی بابەتەکەماندا بووین، ئەگینا لەلای خۆم ئەم باسە کتێبێکە و تەنیا ئەم لاپەڕانەمان خستە ڕوو، چونکە کاک ڕەئوف بێگەرد داوای کرد کە ڕۆڤارەکەمان وتاریّ لەخۆ دەگرێ لە پێنج لاپەڕەی A4 تێنەپەڕێت. بۆیە داوای لێبوردن دەکەم و لای خۆم وایە کە بەکورتی و بەکوردی مەبەستی خۆمم گەیاندووە.



# مەولەوی

## شاهی نەقشبەندی شیعری کوردی



**هومایۆن ساحێب**

### پەنجەرەی ناز:

مەولەوی خۆشەویستی هەموانە، چوون خۆی بە کەسی هەموومان ناساندووە، هەورامی و زەنگەنەو باجەڵان، لە لوورِ و جاف و گۆران و تەواوی کورد بە شارنشین و دێ نشینەوە، خێڵانی بەرەوخوار و بەرەوژوورکەر، کوردستان بە گەرمیان و کوێستانیەوە، مەیخانەکانی حەقیقەت بە خانەقا و تەکیە و جەمنشینانی جەمەوە. میران و ڕەمزەکانی دەسەڵات، بە بابان و ئەردەڵان و لایەنگرانی مەزهەبیی بە سونەو شیعەوە. ساڵ بە چوار وەرزی خۆیەوە. ئەو ماڵ و کەپری خۆی لەوسەرە ڕێبیە کردووە. هەرکەسێ بەرەو مەنزڵی یار بکەوێتە ڕێ، ئەو فەرمووی لێ دەکا و بە بادەی نەشئەبەخش گەرویشی تەڕدەکات. چونکە ئەو لە هەرکوێ عەشق نەمی دابێ، ڕەگێکی شیعری خۆی ناوەتە ئەو گڵە، هەر لەبەر ئەوەشە شیعری ئەو زەرد نابێ و هەموومان بووینەتە ئاودێری ئەو گوڵە. مەرز و بوومی شیعری مەولەوی لەسەردەمی ژیانی خۆیەوە تا بە ئێستا دەگات، نیشتمانێکی دڵڕفێن و شیرین بووە. گەشت بۆ ئەو نیشتمانە مرۆڤ کەیل دەکات و هەرگیز حەز بە تەرکی ناکات، زۆرن ئەوانەی بوونەتە هاونیشتمانی هەرێمی شیعری مەولەوی. کەشکۆڵ و بەیازەکانی شیعری مەولەوی لای هاوفەرد و خۆشەویستانی سەردەمی خۆی یان نەوەی یەکەمی دوای خۆی، تەنیا تۆمارکردن و هەڵگرتنی شیعرەکان بووە، کە مەزنترین کارێ بووە، نەیهێشتووە شیعرەکان لەناوبچن. نەوەی خۆشەویستی شیعری مەولەوی لەدەیەی دووەمی سەدەی

بیستەمەوە لەدایک دەبێت و تا بە ئێستا دەگات لە هەوڵی خستنەوەی نەوەی بەئەمەکدایە، بۆ خزمەتی شیعری مەولەوی.
نامەوێ بەکاری مەولەویناساندا بچمەوە و چوون پێشتر ئەوەم بە درێژی باسکردووە، بەڵکو نیازمە لە پەنجەرەی نازی خۆیەوە بڕوانمە سەر وەچەکڵەی ئەم پرسانە. مەولەوی و عەشق و ژن و پیرو ژیان و مردن و عرفان. مەولەوی و دەسەڵاتە ماددی و مەعنەوییەکان. مەولەوی و ڕۆح و خودا و بەهەشتەکانی داهێنان. بۆ پەنجەبازی هەموو ئەمانەش مەولەوی و زمان و تێگەیشتنەکان بۆ هەڵسوکەوتی ئەو لەگەڵ زماندا. هۆیەکانی بێزارنەبوونی ئێمەیە لە بەردەوام خوێندنەوەی شیعری مەولەوی.

**مەولەوی و عەشق:**

عەشق یان عیشق ئەو چەمکەیە مەولەوی لە تەواوی ئەزموونی ژیانی ئەدەبی (نووسین) و ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیدا کردوویەتیە یەکەمین کارو بگرە تەنیا کاری خۆی. ئەو پێی وایە هاتن و لە دایکبوونی ئێمە، بێجگە بۆ عەشق هیچی تر نییە، ئەوانەی بێجگە لە عاشقی کارێکی تر ئەنجام دەدەن ئەوانە دەمرن، عاشقانن کە هەردەم زیندوون و تەنیا مەیلی لەیلایە ئەوانە بە نەمری دەهێڵێتەوە. مەولەوی خودی ژیان و تەواوی هۆکار و پەیوەندییەکانی خۆی لەم بوونەدا دەکاتە نۆکەر و خزمەتکاری ئەو عیشقە. ئەو بۆ هێشتنەوەی عیشق لە هەمان دۆخی نەگۆڕیی و هەرساتی خۆیدا هەوڵی گۆڕینی هۆکارەکان و ژیانکردن دەدات، دەپیکرێ و دەمرێ و لەدایک دەبێت و دەژێتەوە. ئەو ڕۆح دەخاتە سەر ئەو ڕێیەو بەڕێی دەکات، جەستە دەدات بە تاش و تاوێر و دەریا بێپەی و ناپەیاوەکاندا، بۆ ئەوەی ڕۆح بگاتە هەوار، چەندین خۆراک هەڵدەگرێت، بەتین و بەهێزترینیان، میوزیک و ئامێرە سازەکانی دڵ و بادەو شەرابی زوڵاڵ و دووردی خەستی گۆزەیە. هەرجۆرە دیاردەو پەیوەندییەک لەژیانی ئەودا دەبێتە یادخەرەوەی عەشق و بەمیتۆدی ئەوین دەڕوانێتە شتەکان. لە بچوکترین شتەوە تا گەورەترینیان کە خودایە. (گۆرەوییەکی شڕ، پارچەیەک شووشەی شکاو، گەردی گۆزەیەک، عەباو دەسماڵ و وەنەوشەو..







هتد). کەبابی دۆستێ، خوێی بیردەخاتەوە. خوێ بۆ خۆشەکردن و هەڵگرتنی عەشق. بۆ کولانەوەی زام، کولانەوەی زام بۆ هەردەم خەیاڵدانە بە خاوەنی تیر، ئەویش دەبێتەوە بە لەیلاپەرستی.

**نامەو کەبابت وە مەعدووم یاوا**
**ئەوش نە ڕووی چەم ئێد وە دەم ساوا**
**گەرد دەرد ئێش دەروون بەردەوە**
**عەشقەکەی قەدیم تازە کەردەوە**

کاتێ تۆزو گەرد لەسەر هەرشتێ بنیشێ. دەیشارێتەوەو کۆنی دەکات و ناهێڵێت بەتەواوی خۆی دەرخات. دەردی ئێش لای مەولەوی تۆزی لێ نیشتووە و هەردەم تازەییەکەی ونکردووە، ئەمەش نابێت! لادانی تۆز لەسەر دەرد و دیارخستنەوەی (دەردی ئێش) جارێکیتر نوێ بوونەوەیەتی. مەولەوی بەو ستراتیژەی کە هەردەم پەیڕەوی دەکات بە(خوێ، ئێش، زام) (تعمیر) بۆ دەرد دەکات. چوون شتێ کە خوێی پێوەبکرێت ناگەنێ و خراپ نابێت و قابیلیەتی تازەییەکەی دەمێنێتەوە! دەردی عیشق تا ناسۆر و بە ئێش و بێ ئارام بێت تا بێدەوا و بێ هەتوان بێت، عاشق گەرمتر و سەرحاڵ ترە. بۆیە هەمیشە تەماعی بە دەردی زۆر و ئێش و سوێ بوونەوە زیاترە، ئەمانە مەرحەمەتی زیاتری مەعشوقن، چونکە ئێشی زام: هەم کەمەو هەم بێتام. خوێ ئێشەکە خۆشتردەکات. دەردی عیشق دەگەیەنێتە

ئاستی تەماعەکانی عاشق و دەبێتە دەرمان.
هەمیشەش لەو نێوەندەدا سەختیەکان بە هیچ دەزانێت و هیچ هەپرون بوونێک ناخاتە لاوە، مادام کەڵکی هێشتنەوەی عەشقی هەیە. تەنانەت ئەو لە وتنەوەی وانەی عەشقیشدا بۆ دۆست و یارانی هۆشداری بەرگەگرتن دەدات، بۆ قوتابیە یەکەمینەکان دەڵێت لە کوێتانە؟ هێشتا بۆنی شەمامەی عەشقتان نەکردووە!

## هەڵای هەی ماچی گیرت نەوەردەن
## بۆی شەمامەی ئێش عەشقت نەکەردەن

باوەڕناکەم کەسیتر وەک مەولەوی زاراوەی وا ناسک و جوان و پڕ بە مانای (ئەرێنی) بۆ ژان و ئێشی عیشقی هاتبێ بەخەیاڵا (شەمامەی ئێشی عیشق) هەڵگری جوانی و لەهەمانکاتدا ناسکی و لە هەمووی گرنگتر بچوکییە. ئەم سەرنجە لەشیعری مەولەویدا بە ئاسانی دەدۆزرێتەوە و کەم شیعری هەیە چاوێکی لەم باسە دانەگرتبێ. لەکۆتایی هەمووشیاندا دەگەینە ئەو ئەنجامەی عەشق ئایەتی جیاکردنەوەی مردوان و زیندوان و بەهەشتیی و دۆزەخییان و گەنجی و پیرییە، عەشق لای ئەو هاوهێزییەکە هاوکێشەی وەصڵ و فەصڵی پێ یەکسان دەکات. هەموو گەرمیان و کوێستانەکان و پاییز و بەهاران لە شیعری مەولەویدا لەو چەمکەوە مەلەی مانا دەکەن. بەبێ یار بەهار پایز و نزیکی دوورییە و کوێستان گەرمێن و بەهەشت دۆزەخ و ژیان مردنە، بوون و نەبوونی یارە ماناو بەها بە هەمووشتەکان دەدات.
(وەصڵ و فەصڵ) لە ئەزموونی ئەودا بوونەتە محوەری باس و بایەخی ناوەڕۆکی شیعری ئەو، ئیتر هێنانی زاراوە و کەرەسەی شیعری لەسروشت و هەڵهێنجانی زاراوەکانی نێو سروشتی خودی خۆی بوونەتە تانوپۆی ئەو باسەو تەواوی دژەکان لە خزمەتی کارکردنی وەصڵ و فەصڵدان. هەردووکیشیان لای مەولەوی خزمەتکارە جوانەکانی حەرەمی یارن و ئەم ئولفەتی زیاتری بەفەصڵەوە گرتووە. ئیتر بۆ خزمەتی عەشق هەمیشە مەودای فیراق و دووریی لەیار دەخولقێنێت. دەکۆشێ عاشقان سەرنج و چاوبازییان لەسەر فەصڵ بێت. جواترین شیعری کە بەم خاڵە بخۆن و بەم حاڵە سەرحاڵ بن، ئەو شیعرانەن لەدووری یار وئازیز و دۆستانیدا وتوونی. بۆیە نابینین لە سروشتی شیعرێکدا تەنیا شوێنێک، لەساڵدا وەرزێک و لەباری عرفانیدا بادەو پێکێک و لە تەریقەت و ڕەچەیەکدا پیرێک و ..هتد کردبێتە تاقانە و نازی دابێ بەسەر ئەوانی تردا. بەڵکو مانای هەموو شتەکان پەیوەستی عەشق دەکات و بۆ دەستی ڕاست و چەپی ئەو سوڵتانەی عەشقیش لە فەصل و وەصڵی ڕوانیوە. لە هەرکات و دۆخێکدا کامیان مەسەلەکانی ئەوینی گەرمتر و بە جۆشتر کردبێت، لەو ساتەدا لە زمانی شیعری ئەودا ئەوەیان جێیگرتووە. لە بەرئەوە گرنگە لە لێکۆڵینەوەدا مژنی مەولەوی بە شیعرەوە بناسین. تەنانەت بەهرە نەبردن و بێبەش بوونی مەولەوی لە خۆشی بۆنەو ساتە شادەکان پەیوەندی بەو نشینگەی فەصڵەو بێزووی شیعری عەشقەوە هەیە، بۆ نموونە گەرمیان و کوێستانکردن کە بەشێکە لەژیانی ئێڵی جاف لە شیعری مەولەویدا زۆر بە جوانی جێی گرتووە، بۆ نەوەستان و هەردەم ئەزموونی دووریی و دابڕان و وەسڵ و شادی دەگەڕێتەوە. ئەو دۆستەی زۆرجار لە موناسەبەی شیعری مەولەویدا دێت و دەچێت لە ژیانی کۆمەڵایەتیانەی سەردەمی مەولەویدا شوناسی ناسراو نییە، هەمان ئەو یار و دۆستە هەڵبژاردە نزیکەی ناو ناخ و دەروونی عارفەکان خۆیانە. تەنانەت ئەو نامە شیعریانەش زۆرجار هەستێکی ویژدانیی و پاڵنەرێکی موناجاتیانەیان گرتووەتەخۆ. ئەگەر ئەم ئەزموونی شوێن گۆڕکێیەی دۆستانی مەولەوی بەو مەودا و دابڕانە ڕاستییە، نەخوێنینەوە، ناگەینە پەیبردن بەهێزی ئەو تیرە هاوێژراوەی کە دڵی ئەدەبی مەولەوی سمیوە و چکەی تەڕی دەماندوەتە شیعری بۆنەکانەوە. لەڕاستیدا لەم جۆرە شیعرانەدا (سەرەو ژوور و خوار-گەرمیان و کوێستان و شەماڵ و زەلانەکان) هی ناو سروشت و دەروونی خودی شاعیرن بەمەرامی تەعبیرکردن لە»فاصلەو فراق»ی یار و دۆستی خۆشەویست عارفان لەخۆیاندا خەلقیان کردوون. بە کورتی مەولەوی کاتێ خۆی لەگەرمیانە، ئەوە دۆست لەکوێستانی شیعرا نیشتەجێ دەکات و ئەوکاتەش دۆست لە گەرمیانە ئەو خۆی بە کێوەکانی کوێستانی شیعرەوە دەگەڕێت، لەو شیعرانەشدا تەمەنای مەرگیەتی و ئیزرائیل نایەت، هەر بۆ ئەوەیە وەصڵ بخاتە لاوەو فەصڵ بەرقەرار بێت، چونکە دیسان ئەو مەلەکە دەکاتە عاشقی گیان و بۆ ئەوەی گیان و ئەو فریشتەیە پێک نەیەن، مردن دووردەخاتەوە.







# بوون لای مەولەوی

**د. سەبوور عەبدولکەریم (شکار)**

(بوون) لای مەولەوی، هەندێ جار وەک واتای (بوون)ی دەرەوەو فیزیکی بەکاردێتو هەندێ جاریش بەمانای (بوون)ی مرۆڤ، وەک ئەوەی کە هەیە بەکاردێت و هەروەک هەندێ جار بەمانای (بوون)ی مرۆڤ وەک ئەوەی، کە پێویستە هەبێ و پێبگات بەکاردێت. ئەو لە شیعرەکانیدا زۆرتر وشەی (وجود) و (هەستی) بۆ زاراوەی (بوون) بەکارهێناوە.

هەبوو هەر خودایە، بوون و بوونەوەران سەرچاوەگرتوو و سێبەری ئەون

سەرەتا مەولەوی لەڕێگەی بەدیهێنەری بوونەوە سەیری بوون دەکات، ئەمەش لەم دوو بەیتەی ئەم تێکستەوە دەردەکەوێ:

**ئەی گرد مەوجودێ جە تۆ گرت مایە    مەوجود هەر تۆنی، ماسیوا سایە**
**پەنهان بی تەنها، وەحدەتت مەوج وەرد پەی شناسایی طهوور ێوەت کەرد**[1]

1 دیوانی مەولەوی، ل٣١.

له بەیتی یەکەمدا مەولەوی وەک عارفانو عارفانی فەلسەفی بەتایبەتی، سەبارەت بە هەبوون باوەڕی وایە «شتێک هەبووی ڕاستەقینەیە، کە ژیانی لە خۆیدا بێت، ئەوەشی کە بوونی لە دەرەوەی خۆیەوە هاتبێت، ئەوە بوونێکی زیادکراو (اظافی)یە – نەک لە خۆیدا بێت –. حەق – خودا – هەبوویەکە لە خۆیدا بۆیە زیندووە، ژیانیشی ژیانێکی تەواوەو مردن پێیناگات. هەموو دروستکراوەکانیش هەبوویەکن لە خوارووی خوداوەو ژیانیان جگە لە ژیانێکی زیادکراو هیچی تر نیە، بۆیە فەناو مردن پێیاندەگات»[2] . هاوکات وەک وادەردەکەوێ، دوور نیە کاریگەری فەلسەفەی ئیسلامیی بەتایبەتی ئەو فەیلەسوفانەی کە کاریگەر بوون بە ئەفلاتون لەسەر مەولەویش هەبێت[3] ، لە دێڕی دووەمیشدا بەتەواوی ئەو ئایدیا عرفانیەش، کە عارفان باوەڕیان وایە، جیلوەو دەرکەوتنی دروستکراوەکان – بە مانایەکی تر دروستکردنی دروستکراوەکان – بۆ ناساندنو ناسینی ئەوی پەنهانو نادیارە.[4]
هەروەها ئەو لە تێکستێکی تردا بوونو دروستکراوەکان، بە بەڵگە لەسەر جێدەستی خودا دەزانێ:

**باعث وجوود جەماە تا ماهی**
**دەلیل اثبات صنع ئیلاهی**[5]

بۆیە هەر لە سەرەتای ئەم شیعرەوە بەو بەیتە دەستپێدەکاتو ڕوودەکاتە خوداو بەهۆی هاتنە بوونی لە مانگ (ئاسمان)ەوە تا ماهی (ژێردەریا)ی ناودەباتو هەر ئەوانەش – دروستکراوەکانی دەستی خۆی – بە بەڵگە لەسەر جێدەستی پەروەردگار دادەنێت.
دواتر لەگەڵ خودادا گفتوگۆ دەکاتو دان بە ناشایستەییو گوناهباریدا دەنێتو خۆی بە عادەت گرتوو بە گوناە و بخۆرەوەی ژەهری بێ ڕەحمەتی خوداو لەیادچووی ڕێگەی حەقیقەت دەزانێ، کە یادی بۆ مەحبوبی حەقیقی – خودا – نیە، کە لێرەدا بەیتێک دێت، کە جێگەی لەسەرووەستانە:

**موطن ئەصڵێت نە خاتر لوان**
**مێخ مۆبەتت نەڕووی خاک کوان**[6]

2 د.عبدالمنعم الحفني، معجم مصطلحات الصوفیە، پێناسەی ژیان لای سۆفیەکان، ل٨٤.
3بڕوانە: بەشی یەکەم، پاری دووەم، بیروڕای (فارابی)، ل٥٣.
4 بڕوانە: بەشی یەکەم، پاری سێهەم، ل٦٧.
5 دیوانی مەولەوی، ل٦١.
6 دیوانی مەولەوی، ل٦٣.

لێرەدا مەولەوی باوەڕی وایە ژیانی مرۆڤ لە کاتێکی ترو نیشتمانێکی ترەوە دەستپێدەکات، بۆیە بە خۆی – هاوکات بە ئێمەی مرۆڤی هاوڕەگەزی دەڵێت – کە نیشتمانی ڕاستەقینەت – کە مەبەست جیهانی ڕۆحەکانو بەر لە هاتنە نێو ژیانی دونیایە[7] – کە نیشتمانی ڕاستەقینەی مرۆڤەو چارەنووسی بۆ ئەو جیهانە دەگەڕێتەوە – لەبیرچووەتەوەو مێخی خۆشەویستیت لە خاکی دونیادا داکوتاوە، کە کاتیە، نەک هەمیشەییو نیشتمان بێت. کەواتە مەولەوی جیهانەکەی تر – نەک جیهانی دونیا – بە نیشتمانی ڕاستەقینەی مرۆڤ دەزانێت.

بوونی ڕاستەقینە لە تێپەڕاندنی ئەو (بوون)ەدایە، کە هەیە، بۆ ئەو (بوون)ەی، کە پێویستە هەبێ مەولەوی لە دیالۆگە شیعرێکدا لەگەڵ پارچە شوشەیەکداو، لەمیانەی بەراوردکردنی بوونی خۆی بە بوونی ئەو، دەڵێت:

**١. یاران گشت کەیف وەش، صەفا فراوان یەک**
**یەک وە ئەعلای مەقامان یاوان**
**٢. گرد سەرشار مەی لەقا نماوە**
**هەر من بەستەی خاک چەم ئەودماوە!**
**٣. ئاماوە جواو ڕێزەی قەدیم ساڵ**
**بە زوبان حاڵ فەصیح تەر جەقاڵ**
**٤. من سەنگێک بیم کەفتەی هەواران**

**بێ قەدرو قیمەت نارەوای شاران**
**٥. گرتم نەگەردەن بێ باک و شادان**
**بەڵای پیک سەخت کوورەی ئوستادان**
**٦. ورد بیم جۆشم وەرد تاویامەوە**
**تاوە ڕوتبەی بەرز سەرنیامەوە**
**٧. عالەمێ تازە دیم هوەیدا بی**
**شەخسێ عەجیوتەر جە من پەیدابی**
**٨. بیم بە بلووریێ پڕ جە صەفاو نوور لایق وە**
**صوحبەت بەزم سەلم و توور**
**٩. گا جای (ماء الورد) عەتر عەبیر بیم**
**بۆ بەخش دەماخ شا تا وەزیر بیم**
**١٠. جەو بێ قیمەتی وەقیمەت یاوام**

7 م. مدرس وایلێکداوەتەوەو ئەمەش پراوپڕە لەگەڵ ئەو مانایەی، کە لە فەرهەنگی عارفاندا، بۆ ئەوە دانراوە. بڕوانە: د.سید جعفر سجادی، فرهنگ اصطلاحات عرفانی، ل٧٨٨.



**وە پایەی ڕوتبەی عالی سەرساوام**
**١١. دەورەی دووبارەی ڕای حەق هەرکەس**
**دیش بۆی باخچەی ئەبەد مەیۆنە بینیش**
**١٢. جەو بۆ نۆ ئەو نوور هەڵای تاقی یەن**
**نە ڕێزەی من دا بەرقش باقی یەن**
**١٣. مەعدوومی سەر شار بەزم دڵ ڕێشی**
**تا تۆیچ چون یاران تەصدیع نەکێشی**
**١٤. نەگری وەگەردەن چی ها نەرێت دا**
**پانەنیەی بەسەر وجوود وێت دا**
**١٥. کەی مەشی نە سیلک یاران هەم دەم**
**کەی ڕوتبەی عالی مەوینی وە چەم**
**١٦. هەرکەس تولد دوبارەش نی یەن**
**ئەڵبەت سەعادەت ستارەش نی یەن**
**١٧. هانە ئەشکەنجەی پەستی ی نەنگەدا**
**تا مەنزڵ گێرۆ نە سای سەنگەدا**[8]

وادەزانین ئەم بەکارهێنانو مانایەی (بوون – وجود) لەم تێکستەدا یەکێکە لە مانا قوڵو گرنگەکانی لای مەولەوی. چونکە بەکارهێنانەکەی دەکەوێتە ناوبەند – کۆنتێکست – ێکی سیستیماتیکەوە کە هەموو بەیتەکانی شیعرەکە نەک پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، بەڵکو بە گەشەکردنێکی ئۆرگانیی مەعریفیو هونەری بەرزدا دەڕواتو ڕەنگە بتوانین بێ زیادەڕەوی بڵێین یەک بەیەکی بەیتەکان – وێڕای کۆی تێکستەکە پێکەوە – شایانی لەسەروەستانو لێکدانەوەیە. بەهەرحاڵ مەولەوی بەگشتی لەم شیعرەدا لە بوونی خۆی ڕازی نیەو دەیەوێ لەو بوونەی کە تێیدایە بەرەو بوونێکی نوێ بڕوات، بە زمانی وجودیەکان لە بوونەوە بۆ ماهیەت یان بوونی خوازراوەوە بۆ بوونی ڕەسەن بڕوات.[9] ئەو دەڵێت: ڕۆژێک بیرم لە بەختی ڕەشی خۆم دەکردەوە، کە بۆچی تەنها هەر نوشوستیو نزمی بۆ من دەهێنێ؟ ئەو نوشوستیو نزمیەش زیاتر لەوەدا دەبینێ کە، ئەو – بەیتی یەکەم و دووەم – : یاران هەموو گەیشتن! هەموویان (مەی) دیدارو لیقای یاریان نۆشکرد، مەست بوون بە عیشقی ئیلاهیی، کەچی من هەر لە خوارەوەم – مەبەستی مانەوەیە بە نزمی لە پلەی پێگەیشتنی مەعنەویەتدا یان مانەوە لە ژیانی دونیادا – ، تەنها من نەبێت بەستراوم بە خاکەوە. مەولەوی لێرەدا کە شوشە عەترێک دەدوێنێتو ئەویش بە زمانی حاڵ وەڵامی دەداتەوە، کە دواجار مەبەستیەتی بە بیانووی شوشە عەترەکەوە بەیانی پێداویستیەکانی بڕینی


دیوانی مولوی

و

روحی مولوی

پیکەوە

فورمەي «٨» فاسە

لە چاپخانەی سلیمانی چاپ کرا

١٩٣٥ م ١٣٥٤ ھ

مەقامەکانی بوونو عیشق بکات. فەلسەفەی ئەو ئەوەیە ڕێگەی سلوککردنو تەیکردنی ڕێمان پێ پیشان بدات، کە لەم ڕێگەیەوە بتوانیت خۆت ببڕیت، ئەوەی کە هەیە – کە لە خۆیدا هەیە – تێپەڕێنێت، تا بگەیت بەوەی، کە پێویستە لە






8 دیوانی مەولەوی، ل٢٥٦ – ٢٥٩.

٩ بڕوانە: چەمکی ژیان و مردن لە فەلسەفەدا، ل٦٣ بەدواوە.

خودی تۆدا هەبێت. لێرەوە شوشەکە بە زمانی حاڵ هاتە قسە – بەیتی سێهەمو چوارەمو پێنجەم– و وتی: من بەردێکی بێ نرخ بووم، لەو شاخ و کێوە کەوتبووم، بەڵام ئەوکاتەی بە دڵشادیو بێ ترس – شوشەکە دەڵێ– ، نارەحەتی بەر پیک دانو خستنە کوورەی وەستایانم – کەوا دەزانین هێمایە بۆ ئازارەکانی پەروەردەکردنی بەردەست پیرو مامۆستا مەعنەویەکان – قوبوڵکردو – بەیتی شەشەم تا دەهەم – بە پیکەکەیان وردبووم – واتە بوونی یەکەمم کە بەرد بوو تێکشکاو نەما – و لە کورەکەدا کوڵام – کە وادەزانین هێمایە بۆ سەختی گۆران و قۆناغە سەختەکانی پێگەیشتن لە مەعنەویەتو عرفاندا. تا گەیشتمە پایەیەکی بڵند، کە ئەو پایە بڵندەش ئەوە بوو کە، بینیم جیهانێکی نوێ – جیاواز لە جیهانی (بوونی) کۆنم – پەیدابوو کەسێکی نوێو سەرسوڕهێنەر لەنێو (من)دا پەیدابوو و بووم بە شوشەیەکی پرشنگدارو ڕوناکی وا، کە شایانی سەلم و توور –کە دوو پاشا بوون – بم –کە هێمایە بۆ مرۆڤە گەورەکان وەک یارانی مەولەوی کە لە بەیتی یەکەمدا باسیکردن – بۆیە واملیهات، جارجار گوڵاویان تێئەکردمو بۆنی خۆشم ئەدا بە لووتی پاشاو وەزیرانداو بەم جۆرە، لەو بێ بەهاییەی جارانەوە –کە لە بوونی کەرەستە خاویمدا کە بەرد بووم و ئەو قۆناغانەم نەبڕیبوو – بووم بە شتێکی بەهادار. یان مانایەکی تری وادەزانین ئەوەیە، کە ئەو دەڵێت، من بەهای خۆم لە بێ بەهاییدا دۆزییەوە! واتە دانم بە بێ بەهایی خۆمدا ناو ئامادەبووم خۆم بەوپەڕی خاکی بوونو نەمانی (منیەتی) و بەها بۆ خۆدانەنانەوە بخەمە بەردەست پیک و زەبری مرۆڤە مرۆڤسازەکانەوەو بەوەش – بەیتی یانزەو دوانزە – سوڕی دوبارە لەدایکبوونم بینی و سەرم گەیشتە پلە بڵندەکان و بۆیە، بەو بۆنەوەو هۆیەوە – ئەو دەڵێت – ئەگەرچی ئێستا شکاوم – واتە ئەگەر پیریش بم و لاواز – هێشتا مێشکی ئەو دوبارە لەدایکبوونەوە تێمدا ماوەو بریسکە دەداتەوە. دواتر ڕاستەوخۆ – دیارە بە زمانی حاڵ – بەیتی سیانزە تا حەڤدە – ئامۆژگاری مەولەوی دەکات و دەڵێت: تا تۆش وەک (من – یارانی خۆت) زەحمەت و سەختی کوورەی مەعنەوی نەبینی و تا تۆش (نەگری وەگەردەن) – هەمان دەربڕینی قسەی شوشەکەیە لە بەیتی (٥)دا – واتە قەبوڵی نەکەیت ئەو سەختیانەی کە لەو ڕێگایەدا هەیەو پێ نەنێی بەسەر بوونی خۆتدا – مەبەستی بوونی یەکەمە کە پێنەگەیشتوویتو بە زمانی عارفان گیانلەبەری بەر لە گەیشتن بە مرۆڤی[10] – و (منیەتی) ئەو قۆناغەت تێنەپەڕێنی و دەست لە خۆت هەڵنەگری و لێی بڵندتر نەبیتەوە، ئەوا، کەی دەچیتە ڕیزی یارانتو چۆن پایەی بڵند بە چاوی خۆت دەبینی؟ چونکە، تا جاری دووەم – تۆو هەرکەسێکی تر – لەدایک نەبیتەوە، ئەوا ئەستێرەی خۆشبەختیت لێهەڵنایەت و بەوەش گەر وانەکەیت، ئەوا لە ئازاری پەستی – هەمان وشەی بەیتی یەکەمی دیوانەکە – واتە نزمیدا، کە مایەی نەنگیە تا ئەمریو دەچیتە گۆڕ بەوجۆرە دەمێنیتەوە. واتە دواجار شیعرەکەی مەولەوی پێمان دەڵێت بەر لە گەیشتنمان بە گۆڕی مردنی ڕاستەقینە، دەبێت خۆمان لە گۆڕی مەعنەوی – مردوویی و نەگۆڕان – بەرەو لەدایکبوونی دووەمو بە مرۆڤبوونی ڕاستەقینە ڕزگار بکەین.



## سروشت (زەڵم) پیرێک ڕێگەی یاخیبوون لە بوونی ساختەوە بۆ بوونی ڕەسەن

مەولەوی لە شیعرێکیدا، کە سەرەتاکەی بە وەسفی سروشتو هاتنی بەهار – لە بەیتی ١–٧ – دەستپێدەکات، بەڵام لە بەیتی حەوتەوە، لەنێو باسکردنی دیمەنەکانی سروشتی بەهارەوە، لەگەڵ چەمی زەڵم – وەک کارەکتەرێک – دەکەوێتە گفتوگۆو لە باسکردنی سروشتو شوێنکاتەوە بەرەو سەرروو شوێنکاتو شتە ئەنتۆلۆژیو قوڵەکان دەڕواتو پێی ئەڵێ:

**١. چەنی جە هەستی وێت تەواساییت**
**چەنی جۆش عەشق مەجنوون ئاساییت**
**٢. بدیە چۆن هۆردان وەنام و نەنگدا**
**بێ پەروا مدۆوینش وەرووی سەنگدا**
**٣. های ساقی! هەڵای سەرمایەی خامی**
**نمەدۆم وە دەس ڕای نێکنامی**
**٤. با وەرە وەش وەش سادەی هەی پەی کەی**
**تاف قەڵوەزەی ساف شیشەی مەی**
**٥. مەوجم بنچینەش بدۆ وە هەم دا**
**هەستیم دۆ وە بەرد هەرد عەدەم دا**[11]

واتە ماشەڵڵات لێبێت – بەیتی یەکەمو دووەم

---

**١٠وادەزانین ئەم مانایە حافزی شیرازی بە ڕوونی دەریبڕیوە کە دەڵێت:**
**رندی أموزو کرم کن کە نە چندان هنرست**
**تا حیوانی ننوشد می و انسان نشود**
**بڕوانە: ئەکرەم عەنەبی، مەحرەمی ڕاز (شەرحی غەزەلەکانی حافز)، بەرگی دووەم، ل٢٦٩.**
**١١ دیوانی مەولەوی، ل٤٦٨ – ٤٦٩.**

– دەستخۆشیلێکردنە – لەو بێزاربوونو یاخیبوونەت لە (بوون)ی خۆت، کە لە جۆشی عەشقی وەک مەجنونیتەوە واتلێهاتووە عەیبەت خستوەتە لاوەو لە ناوو ناتۆرە – ئەمە بیری سۆفیگەری مەلامەتیە[١٢] – ناترسیو بێ پەروا خۆت دەدەی بەو تاش و بەردە – واتە کۆسپەکانی ڕێ – دا. لێرەوە شاعیر ئەم دیمەنەی زەلم – سروشتو شوێنکات – بەرەو مەسەلە قوڵەکانی سەروو شوێنکاتی دەباتو ڕوودەکاتە ساقی – خودا – و پێی دەڵێ – بەیتی سێهەم تا پێنجەم – ئەی ساقی – خودایە – من هێشتا – خامی – پێنەگەیشتن – کە لای عارفان بۆ ئەوانە بەکاردێت کە لە سەرەتای ڕێگادانو پێیان نەخستوەتە دۆڵی عشقو پێگەیشتنو تێگەیشتنی مەعنەوییەوە.[١٣] نامداتە دەست ڕێگای ناوو ناوبانگی باش – واتە ناوباشیی عرفانی نەک ناوبانگی دونیایی – بۆیە، دە ساقی تۆ خۆت بۆ کەی هەڵگرتووەو دەسا زووکە لە تاقگەی سافی[١٤] شوشەی مەیەکەتەوە، تاقگەی (مەی)م بۆ بەربدەرەوە تا بەو قەڵبەزەو تاقگەی مەی – عەشق و یاخی بوون و مەعنەویەت – منیش وەک زەڵمم لێبێتو شەپۆلەکانی، بنچینەی (بوون)م بدات بە تاش و بەردی نێو خودی خۆمدا (بوون)م بدات بە تاش و بەردی عەدەمدا – جیهانی نابەرجەستەو ئەزەلی و فراوانی پشتەوەی جیهانی سروشتی مادی[١٥] –.

کەواتە مەولەوی لێرەدا بەڕوونی لە (بوون)ی خۆی ناڕازیەو دەیەوێ لە (بوون)ەوە بۆ (هەبوون) وەک عارفان دەڵێن بڕواتو هەر ئەمەش – خۆدان بە دارو بەردا کە تێکوپێکدانی سروشتی یەکەمی ئەوە – لە خۆیدا مردنی ئیختیاریەو هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە لەدایکبوونێکی تر، کە ئەوەش بە گەیشتن بە جیهانی عەدەم دەبێت.




١٢ مەلامەتی ڕێبازێکی سۆفیگەرییە، کە دروشمەکەی لەلایەن دامەزرێنەکەیەوە کە (حەمدونی قەسار)ە بە (الملامە ترک السلامە – مەلامەتی بریتیە لە وازهێنان لە سەلامەتی)، واتە ئەوان تەنها بایەخ بە حەق – خودا – دەدەنو گوێ بە خەڵک نادەن، تا ئەوەندەی کە خەڵک لۆمەیان دەکات. ئەوان لەپێناوی پوختی (اخلاص) و ڕاستگۆیی لە کاردا بۆ خودا زۆر هەوڵدەدەنو دەیانەوێ کە بەپێچەوانەی خەڵکەوە – خواپەرستی و کردارە باشەکانیان بشارنەوەو کردارە ناباشەکانیان – یان هەندێ جار واش نیشانبدەن – دیار بێت تا لە ڕوپامایيو ستایشی خەڵک بەدووربن. بڕوانە: د.سید صادق گوهرین، شرح اصطلاحات تصوف، جلد ١٠، ١٣٨٣ – ٢٠٠٢، چ١، انتشارات زوار، تهران، ل٣٥١-٣٥٣. هەروەها د.سید جعفر سجادی، فرهنگ اصطلاحات عرفانی، ل٧٤٢.

١٣ بڕوانە: د.سجادی، فرهنگ اصطلاحات عرفانی، ل٣٣٨.

١٤ (سافی) و (سەفا) لای عارفان بەمانای لابردنی ژەنگی پیسیو تاریکی لە دڵان دێت. د.سجادی، ل٥١٩. کە لێرەدا وادەزانین مەولەوی مەبەستی لەو مەیەیە، کە عەشقی دەداتێ و مەستی دەکاتو بێباکی دەکات لە ژەنگی ڕوپامایيو عەیبەو ترسان لە خەڵک و وەک زەڵمی لێدەکات.

١٥ بۆ مانای (عەدەم) لای عارفان، بڕوانە: ژیان و مردن لە سۆفیگەری و عرفانی ئیسلامیدا، ل٧٠.


دیوانی مەولەوی
«سەیید عەبدوڕڕەحیمی کوڕی مەلا سەعید»
کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە و لەسەر نووسینی
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس
لەگەڵ ئاوەروکی شیعرەکان
(کشف الابیات)


دیوانی مەولەوی
لەسەر بناغەی تیکوشانی
مەلاعەبدولکەریمی مودەرریس
B.TARA
پێدا چوونەوە و ڕێک وپێک کردن و زیاد کردنی :
موحەممەد حیجازی - حەسەن گۆران


پرۆژەی ۱۰۰ کتێبی کوردی
٥٩
دیوانی مەولەوی
سەید عەبدولرەحیمی مەعدووم
لەلایەن مامۆستا محەمەد ئەمین ئەردەلانی ەوە
کراوە بە سۆرانی
پێداچوونەوەی بە دەستکاریەوە:
گوران عەباس


مەولەوی
و
تەقینەوەی زمان
حەکیم مەلا ساڵح

# ژیان
# وەک چەمکی ژیان
# لای مەولەوی





**د. سەبوور عەبدولکەریم (شکار)**

شاعیر لە چەند تێکستێکدا باس لە ژیان دەکات، بەبێ ناوهێنانی ژیانو بە ناڕاستەوخۆ ئەوە دەردەبڕێت، کە چەمکەکانی لەمانە پێکهاتوون: (ژیان گوزەرو تێپەڕگەیە. ژیان، مەمکە، مرۆڤ پێدەگەیێنیو دواتر دەیبڕێتەوە!. ژیان یاریەکە، دواجار دەبێ مرۆڤ بیدۆڕێنێ!. ژیان مەیخانەیە. ژیان کاتێکە بۆ مرۆڤ دیاریکراوە. ژیان تاریکەو بڵێسەی مەستیی مەعنەوی ڕووناکی دەکاتەوە. دۆست ژیانە، دەرکەوتنی ڕۆژو بژێوییەو دیارنەمانی تاریکیو پشووە).

لە دیدی مەولەوییەوە، ژیان گوزەرو شوێنی تێپەڕینە، کە مرۆڤ لێوەی خۆی دەدات بە دەست مەرگەوە، بۆئەوەی ئەو تێپەڕینەش ئاسانتر بێت، چارە لە دەستی (ساقی)دایە، کە پیاڵەیەک مەیمان بداتێ، تا بە مەستییەوە خۆمان بسپێرین بە مەرگ!:

**دێرەن با ئێمەیچ نەی گوزەرەوە      جامێ وەدەس نێین، دەس وە سەرەوە**[1]

ئەو لە تێکستێکی تردا، جارێکی تر ژیان بە گوزەرو شوێنی تێپەڕین، بەڵام شوێنێکی تێپەڕینی تەسک دەزانێ، کە هەر ئەوەندەت زانی ئەجەلو مردن وەک سمی ئەسپ دێتە سەرت!:

**نەی گوزەرگای تەنگ بازاڕ چەپ گەرد هەر کاتێ زانای ئەجەل سمکۆ کەرد!**[2]

ئەو، کە ژیان وەک (شوێن) بە گوزەرو تێپەڕگە دەبینێ، وەک (کات)یش، دووبارە بەوەی دەبینێ، کە

---

١ دیوانی مەولەوی، ل٢٨٠.

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦٠.

بەردەوام لە گوزەرو تێپەڕیندایەو ئێستاش وەک ڕابردوو لە تێپەڕیندایە:

**حاڵ ماچی ئاسا هانە گوزەردا**
**مقیم مسافر ڕەنگ نە سەفەردا**[3]

لە دیدی مەولەوییەوە، ژیان مەمکێکە کە، لە بێشکەی دونیادا شیر دەدات بە مرۆڤو پێیدەگەیێنێ، بەڵام مرۆڤ نابێ خۆی لە قۆناغی شیر خواردنو منداڵیدا بهێڵێتەوەو لەوە بێئاگابێت، کە ڕۆژێک کاتی بڕانەوەی لە شیر – مردن – دێت:

**هەر طفلێ بێ شک نەی بێشک خەفتەن**
**جەی دایە بڕیان بەودایە جفتەن**

بۆیە دەبێت بێداربێتەوەو دەست لە خۆڵاو یاریکردن دەربهێنێو بزانێ ئەویش – شاعیرو هەموو مرۆڤەکان – کاتی بڕانەوەی لە شیری ژیان دێت:

**وەس خاکبازی کەر بێدار بەر ئامان**
**بڕیانەوەی تۆیچ سەرووەختش ئامان!**[4]

ئەو لە بەیتی یەکەمی هەمان تێکستدا، هەمان (تێمە – theme) دەردەبڕێتەوەو ژیانو دونیا لەڕووی (کات)ەوە، وەک بێشکەیەکی سوڕاوە دەبینێ، کە تاڵی دەسڕازو پێچانەوەکەی لە خەم هۆنراوەتەوە. ناکرێ ئێمە لەم بێشکەی ژیانەدا تا سەر بێئاگایانە بژینو گەورە نەبینو پەنجەی بێئاگایی وەک منداڵ ببەین بە دەمماندا!:

**نەی گەهوارەی دەور تای دەسرازە خەم**
**تاکەی سەر ئەنگوشت غەفڵەت نەتۆی دەم!**[5]

ئەو باوەڕی وایە، قەدەرو قەزا وەک قومارچییەکە، کە خۆی ئامادە دەکات بۆئەوەی مرۆڤ بدات بە دۆڕاندن و ئەوەی کە هەیەتی – کە ژیانیەتی – لێبستێنێ:

**قەزا وە قومار نەپای باختەمەن**
**قامەت حەڵقە بەست وەخت تاختەمەن!**[6]

لە دیدی مەولەوییەوە ژیان ئەگەر عرفانو ساقیو مەی مەعنەوی تێدابێت، ئەوا دەبێ بە مەیخانەو ئەوکات مرۆڤ بە مەستیو خۆشی تێیدا دەژیو ساتە ناخۆشەکانی تەنانەت ساتی بەجێهێڵانی ژیان – مردن – بەخۆشی بەسەردەباتو بەڵکو ئارەزووی مردن دەکات، تا ئەم مەیخانەیە[7] ئەمیشی تێدا نەمێنێت!:

**تەمامەن بەرات قەبچ و حەواڵەم**
**دێرەن کەرەم کەر بدەر پیاڵەم**
**تا هیممەت وازوو وەیەک پەیمانە**
**خاڵی بۆ جێمەیچ گۆشەی مەیخانە!**[8]

ئەو وەک موسڵمانێک باوەڕی بە یەکێک لە پرەنسیپە سەرەکیەکانی ئایین هەیە، کە ئەویش قەدەرو قەزایەو لەنێو ئەو پرەنسیپەشدا باوەڕی بەوە هەیە، کە خودا پێشوەخت بڕیاری لەسەر سنورداری ژیان بەگشتیو ژیانی یەک بەیەکی مرۆڤەکان – کە لە خاڵێکدا کۆتایی بێت – بەتایبەتی داوەو خودا بە نوسەری ئەزەلیی، ئەمە دەزانێت:

**سیا هەی دەفتەر میرزای ئەزەلەن**
**زیادی و نوقسان ڕزق و ئەجەلەن**[9]

لە ئایدیای شاعیردا، ژیان تاریکەو مرۆڤ پێویستیی بە مەستی مەعنەوی هەیە، تا لە ناخیدا بڵێسە بداتو بەهۆی ئەو چراو مەعنەویەوە، لە دەشتی تاریکی ژیانیدا ڕێگە بدۆزێتەوەو ون نەبێو بتوانێ بگاتەوە بە مەنزڵ و جێگەی خۆی – ژیانەکەی تر – :

**جە تۆ قەهقەهە، جە پیاڵە مەی**
**جە ساقی هادەی، جە ئێمە بابەی!**

**شەرارەی مەستی ی مەی بەرشۆم نەدڵ**
**وەو چراخەوە یاوون وە مەنزڵ**[10]

لە دیدی شاعیردا دەرکەوتنی دۆست – کە عارفو زانایە لە مزگەوتدا – لە سبەیناندا مایەی ژیانو بژێوی – بژێوی مەعنەوی – دۆستە ئازار چەشتووەکانیەتیو ئاوابوونی لە ئێوارانداا مایەی حەسانەوەیانە، واتە چ بە دەرکەوتنی یان دیارنەمانی ژیان لەودایە:

**طلووع و غرووب صوب ئێوارانەن**
**مەعاش و سەبات دەردەدارانەن**[11]



٣ سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٢.
٤ سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٠.
٥ سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٧.
٦ دیوانی مەولەوی، ل٤٢٨.

٧ مەولەوی، کە باوەڕی وابوو ژیان ئەگەر مەستی مەعنەوی تێدا بێت، ئەوا مەیخانەو خۆشیە، لێرەوە (خانەقا)ش وەک شوێنی ئەو مەستبوونە، بە مەیخانە ناودەبات: دەفنت نە پەهلووی مەیخانە کەردەن (دیوان، ل٥٣)

٨ دیوانی مەولەوی، ل٤٧٢.
٩ سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٤.
١٠ سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧١.
١١ سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩٥.



# تێڕوانینی
# مەولەوی
## بۆ سروشت بەپێی وەرزەکانی ساڵ



**کوردستان ڕەزا ساڵح**

سروشت و وەرزەکانی:
لە دیوانەکەی مەولەوی (24) غەزەل هەن کە بۆ سروشتی کوردستان و هەڵسوکەوتی مرۆڤی کورد و دەوروبەری وتراون کە حەوت غەزەلی بەهارین و دووانیان پاییزە غەزەلن بۆ هەریەکێک لە وەرزەکانی هاوین و زستان غەزەلێکی نووسیوە.

**وەرزی بەهار لە دیدی مەولەوی:**

بەهار وەرزێکە کە سروشت بۆ ڕازاندنەوەی خۆی تێکەڵکێشی کردووە بە وەرزەکانی تر هاوتای خشڵی ڕازاوە کە بەیاقوتی گرانبەها ئەڕازێنرێتەوە، بۆیە هەر کەس بەشێوازێک وەسفی بەهار دەکات لای خۆی، سروشتی بەهاری کوردستان کە هەموو شاعیران کەم تا زۆر شیعریان بۆ وتووە و کەرەستەکانی ئەم سروشتە جوانەیان بەکارهێناوە بۆ مەبەستە شیعرەکانی خۆیان، بەڵام وەک ڕێژە لەناو شاعیران کەم و زۆری هەیە، شاعیری گەورەی کورد مەولەوی بەڕێژەیەکی زۆر شیعری بۆ نووسیوە و شیعرەکانی مەولەوی گەرچی بە دیمەن ڕازاونەتەوە بۆ سروشت، بەڵام لەپشتەوە چەندین خوێندنەوەی تر هەڵئەگرن، واتا مەرامەکانی تری بە جلوبەرگی سروشت داپۆشیوە، بەتایبەت کە خۆی

سۆفی بووە، بۆیە ناکرێت تەنها بەیەک شێواز خوێندنەوەیان بۆ بکرێت.
بەهارە غەزەلەکانی مەولەوی گەرچی بە دیمەن وەسفی سروشت دەکەن، بەڵام لە لایەک دەتوانین بە لاواندنەوە و لە لایەکی ترەوە کە ئەم شیعرانەی باڵای یاری پێک هێناوە دیاری بکەین، لەناو ئەو حەوت غەزەلە بەهارییە، ئێمە نموونەیەک دەهێنینەوە، وەک:

**بەرزان هیلال تار وەروان قەراردا**
**غوڕڕەی شار شۆر دڵان دیاردا**
**نەسیم وە بۆی چین چنووری ڕووی هەرد**
**سوب "صباح الخیر" دەماخ دڵ کەرد**
**جە پرژەی شەونم نە تۆی پەردەوە**
**نەرگس مەس مەس چەم وەڵاو کەردەوە**
**سەوزە وەستەن ئەو چەمەن دەس دەس**
**گوڵان جام وە دەس بولبولان سەرمەس**
**مەنعم مەکەردێ گرانەن دەردم**
**ئەر شێویا بۆ قافیەی فەردم**[1]

مەبەستی لەوەیە لە بەهاردا هەموو خەڵک دڵی خۆشە واتا مانگی خۆشییە ئەو خۆشییە لە دڵی خەڵکیدا دیاری داوە وە بەئاسانی دەبینرێت.
بێگومان ڕۆژانی ئاسایی کەسێک مەرحەبات دەکات بەڵام لە بەهاردا بۆنی گوڵەکان بەیانی باشت لێ دەکەن، بە گشتی لەچوار بەیتی یەکەمدا باسی سروشت دەکات، بەڵام لە بەیتی پێنجەم وەکو هەواڵ گەیاندنێک باسی دڵی خۆی دەکات دەڵێت: ئەگەر قافییەی بەیتم شێوا و نارێک بوو ئەوا شیعر و ناخی من خەمبارە لەبەر ئەوەیە گلەیم لێ مەکەن، هەروەها وشەی فەرد ئاماژەیە بەتاک و تەنهایی شاعیر، لەوە دەچێت لەدوای مەرگی هاوسەرەکەی ئەم غەزەلەی هۆنیبێتەوە، چونکە لەبەیتی شەشەم و حەوتەمدا گلەیی لە بەختی خۆی دەکات و بەختی خۆی بەو زەوییەی کە وشکە و هیچی لێ ناڕوێت دەشوبهێنێت و گلەییەکەی کە دەڵێت سەوزەی هەموو کەس شین بوو و ڕوا، بەڵام سەوزەی ئاواتەکانی من شین نابێت و گوڵی هەموو کەس ڕواوە گوڵی من نەبێت.
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لێکدانەوەکەی واکردووە کە گوڵی من لەناو خاکدایە و سەردەرناهێنێت.
ئەمەش لەگەڵ بۆچوونی ئێمە یەک دەگرێتەوە کە

کەسێک مرد بێگومان زیندوو نابێتەوە لەم دونیایە و ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئاسایی واتا وشەی خاک نەگەڕانەوە بۆ ئەم ژیانە ئەمە نیشانەیە بۆ ئەوەی خێزانەکەی مردووە و هەروەها لە بەیتی هەشتەم دەڵێت:

**فەریاد جەشۆرەی ئەرز چارەی من**
**هەر سەوزەی موراد من نادیارەن**
**داد جەهەوای شووم بەد ستارەی من**
**هەر نەو گوڵاڵەی من نەپێوارەن**
**یاوەلوەلەی دەف شا دەروێش، جۆشی**
**بەو سەدای ڕیشەی دڵ ئاشناوە**
**یا جۆش سەمتوور موتریب، خرۆشی**
**چەنی ئەی دوو فەرد حەسرەت مەعناوە**[2]

وشەی وەلوەلە بەواتای زریکە دێت، زریکە و هاوارێک بەگریانەوە، بێگومان مەولەوی ڕوو لە دڵی خۆی دەکات دووری نێوان خۆی و یاری ئەوەندە خەمی لە دڵی دروست کردووە کە بە دەنگی بەرز هاوار و ناڵانەوە دەکات، وەک دەروێشێک بۆ خوا چۆن دەپاڕێتەوە و دەگری واتا لەتاو دڵی برینداری و دووری لە خۆشەویستەکەی دەروێش ئاسا دەپاڕێتەوە بۆ وەسڵی یاری بێگومان یار زیندوو نابێتەوە و ئەم وەسڵە واتا لە ژیانی ئەو دنیایا چونکە ڕوو لە دڵی خۆی دەکات و دەڵێت:

**یا جۆش سەمتوور موتریب، خرۆشێ**
**چەنی ئەی دوو فەرد حەسرەت مەعناوە**[3]

ئەی ژەنیار بە کوڵ بگری و هاوار بکە، چونکە ناڵەو هاوارت وەک ئامێری سەمتوور وایە هاوار بکە و بڵێ بۆچی دەبێت ئەم دوو خۆشەویستە تەنیابن و بە حەسرەتی ببینین یەکترن؟ شاعیر خۆی بە ژەنیار ناو بردووە و ناڵەو هاوار و گریانی خۆی بە مۆسیقای ئامێری سەنتور ناو بردووە و بەخۆی دەڵێت: با ئەم گریانە ئەوەندە بەردەوام بێت ئەوەندە فرمێسک بڕێژە تا وەکو تۆوی ئارەزووی دڵم سەوز بێت، واتا تا خوا نزاو پاڕانەوەم قبوڵ دەکات، بەڵکو خۆشەویستەکەم ڕووی خۆی بنوێنێت و دەرکەوێت، بێگومان ئەم بەیەک گەیشتن و بینینی یار زیندووبونەوەی یار نییە.
وەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، بەڵام عەبدولکەریمی مودەڕیس ئەم بەیتەی وا شی کردۆتەوە (کەوا لەبەرەبەیانا گووڵ ڕووی خۆی



١ لێکۆلینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، چاپی پێنجەم، چاپخانەی کوردستان، سنەندج، ١٣٧٨ هەتاوی، ل٩٢
٢ مەلا عەبدولکەریمی، دیوانی مەولەوی، ل٩١
٣ سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢




بنووێنێت)[4] ئێمەش هەمان ڕامان هەیە بەڵام نەک بەزیندووبونەوەی یار بەڵکو بە مردنی شاعیر لە بەرەبەیان داو گەیشتنی بە وەسڵی یار. بەڵام دکتۆر ڕەئووف عوسمان دەڵێت: "ئەم شیعرەی، مەولەوی بەبۆنەی مردنی کوڕەکەی وتویەتی)[5]، بەڵام ئەمە لەگەڵ بۆچوونی ئێمەدا یەک ناگرێتەوە لەبەر چەند هۆکارێک:

1. فەرد بەواتای تاک و تەنها دێت کە پێچەوانەکەی جووتە مرۆڤ لە ژیانیدا کە هاوسەرگیری دەکات جووتە بە نەمانی لایەکیان دەبێت بە فەرد یان تاک و تەنها وەک شاعیر ئاماژەی پێداوە کە هەرگیز ئەم وشەیە بۆ منداڵ بەکار نایەت.




2. وشەی گوڵ بۆ ئافرەتە نەک بۆ نێرینە، لە ئەدەبی کلاسیکی و ڕۆمانتیکی هەرگیز وشەی گوڵ بۆ کوڕ بەکار نەهاتووە و نایەت.

٤ **مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، چاپی پێنجەم، چاپخانەی کوردستان، سەنەندج، ١٣٨٦ هەتاوی، ل٩٣**

٥ **ڕەئووف عوسمان، ئاسۆیەک بۆ ڕەخنەی ئەدەبی، چاپخانەی وقف الحدیسە، بەغداد،٢٠١١، ل٢٢٣**

3. وەسڵ و گەیشتن بۆ کوڕ و باوک نابێت، بەڵکو وشەی وەسڵ بۆ یارە کە شاعیر لە دێڕی کۆتایی ئاماژەی پێ داوە بۆ یارەکەی کە هاوسەرەکەیەتی.

## وەرزی هاوین لە دیدی مەولەوی:

مەولەوی شاعیرێکە هێندە بلیمەتە نە تەنها کەرەستەکانی سروشتی بەکارهێناوە بۆ هاوتای خەمەکانی خۆی، سروشتی هاوینیشی بێبەش نەکردووە و لە قرچەی گەرمای هاویندا چەندان تابلۆی زۆر کاریگەر و هەژێنەرمان بۆ دەنەخشێنێت و ئەم وەرزە هاوتای دڵ و دەروونی قەرچۆڵی خۆی دەکات، گەرما هێندە لە ڕادەبەدەرە چیمەن و خونچە و گوڵزاری هەڵپرووکاندووە، لە هەمان کاتیش دا ژیلەمۆی بە هێلانەی دڵاندا وەشاندووە، چریکەی بولبولیش لە هیچ لایەکەوە نابیسترێت و مەولەوی بەر لە هەموان هاوار دەکات و دەڵێت:

**ها من، ها، من وار، گەرمیش جۆش ئاوەرد**
**فەزای نەزم بەزم نەو گوڵاڵان بەرد**[6]

بەڕێز عوسمان هەورامی هەمان بۆچوونی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی هەیە و درێژە پێدەری بۆچوونەکەی مامۆستایە و ئەویش دەڵێت: کە بۆ وەرزی هاوینی وتووە.[7]

بەڕێز عەلی شێخ عومەر قەرەداخی لە (مەولەوی و سروشتەکەی)دا لێکدانەوەکەی هەر وەک لێکدانەوەکەی مەلا عەبدولکەریمە کە بۆ دیوانەکەی کردووە کە گوایە باسی وشک بوونی گوڵ لە وەرزی هاوین و قڵیشانی زەوی بەهۆی بێ ئاوییەوەیە[8]

بە بۆچوونی ئێمە دەبێت کارەساتێک ڕوویدابێت کە کاری لە شاعیر کردووە کە بەو شێوەیە وەسفی گەرمای هاوینی کردووە و هاوتای دڵ و دەروونی خۆی کردوە، چونکە لە بەیتی دووەمدا دەڵێت: خۆڵەمێشی وەشاندوە بە ماڵی هەموو گوڵاڵەکان، بێگومان گوڵاڵە لە ئەدەبی کلاسیک دا هێمایە بۆ ئافرەت، هەروەها جەم بە واتای هەموو دێت، لێرەدا گوڵاڵە بە تاک نەهاتووە بەڵکو بە کۆ هاتووە کە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە

6 **مەلاعەبدولکەریمی** مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل٥٢٨

7 عوسمان هەورامی، چەن وێنەیەکی گەشتە وەرزی ناخی مەولەوی، **میهرەجانی** سلێمانی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری **سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٩٠**

٨ **عەلی شێخ عومەر قەرەداغی، مەولەوی و سروشت، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٨، ل٢٥**

کارەساتێک ڕووی دابێت، چونکە لە نیوە دێڕی دووەم دا دەڵێت:

**بووڵ وە یانەی جەم نەو گوڵاڵان شەند**
**چەمەن بێ نەوای ناڵەی بولبول مەند**[9]

مەند، وەک وشەیەکی سەربەخۆ بەواتای بێدەنگ دێت کە واتا ئێمە لەگەڵ بۆچوونەکەی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیسین، چونکە لێرەدا مێرگەکان بێ ئاواز و ناڵەی بولبول مانەوە، دەشتایی و مێرگ کپ و بێ دەنگە لە ئاواز و ناڵەی بولبول، بەڵام ئەم بێ دەنگییە بۆچی؟

بێگومان واتای تەواو بە هاتنی بەیتەکانی دواتر ڕوون تر دەبێت، لە بەیتی سێیەم دەڵێت:

**تای بەڕەزای شەنگ نەسای موغاران**
**شێونا چوون زوڵف تەعزێە داران**[10]

بێگومان وێنەیەکی زۆر جوانی دروست کردووە کە بە (ڕەزەی) بە پرچ و زوڵفی ئافرەت شوبهاندووە، بەڵام ئەو ئافرەتانەی کە تەعزێدار بوونە چۆن قژی خۆیان دەڕننەوە بەهەمان شێوە لێرەش ئاماژەی بە کۆ کردووە، واتا ئافرەتان بە کۆ خەریکی شیوەن کردنن.

لە بەیتی چوارەمدا دەڵێت:

**ها، کاوان، کاوان دڵ چوون دڵ ڕێشان**
**هەردان وە سەردا هەردان پەی وێشان**[11]

بێگومان لە ئەدەبی کوردیدا چیا هێمایە بۆ کەسێکی مەزن و دەسەڵاتدار، یاخود حکومەت دەسەڵاتداری سەردەم. لێرەدا پرسیارێک دێتە ئاراوە کە ئاخۆ چ کارەساتێک قەوما بێت کە شاعیر بەو شێوەیە وەسفی سروشتی کردووە؟ بۆچی چیاکان قووڕ ئەدەن بەسەر خۆیان؟

بێگومان لەو سەدە و چەرخەی مەولەوی تیا ژیاوە، واتا لە سەرەتای 1800 تاوەکو کۆتایی 1800 زاینی چوار میر نشینی کوردی لەناوچوون، ئەوانیش میرنشینەکانی (ئەردەڵان، موکریان، سۆران، بابان) بوون.

میرنشینی بابان لە ساڵی 1850 یان 1851 لەناو چووە.

---

**٩ بەپێی وشە نامەی جەمال بێدار مەند وەک پاشگردێت و وەک وشەیەکی سەربەخۆش دێت ئەگەر وەک پاشگر بچێتە سەر هەر ناوێک ئەوە دەبێتە ئاوەڵناو ئاسا، بەڵام ئەگەر وەک وشەیەکی سەربەخۆ هات بە واتای مەنگ دێت.**

**مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل٥٢٨**

**١٠ سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢٩**

**١١ سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢٩**



میرنشینی سۆران لە ساڵی 1858 لەناوچووە کە بەدڵنیاییەوە لەناوچوونی ئەو میرنشینە وای لە مەولەوی نەکردووە کە ئەم شیعرەی بۆ بهۆنێتەوە، چونکە دوور بووە لە مەڵبەندی ژیانی مەولەوی.

میرنشینی موکریان لەسەردەمی نەصرەدین شای قاجار لەناو چووە، میرنشینی ئەردەڵان لە ساڵی 1867 لەناوچووە، لەوانەیە ئەم شیعرەی بۆ لەناوچوونی میرنشینەکانی بابان یان ئەردەڵان وتبێت.

بەڵگەکانی ژیانی شاعیر ئەوە دەسەلمێنێت و دکتۆر ڕەئووف عوسمان دەڵێت: "مەولەوی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ پیاوانی ئاینی و شاعیرانی سەردەمی خۆی و پیاوانی بە دەسەڵاتی وەک (ئەحمەد پاشا و عەبدوڵا پاشای بابان و مەحمود پاشا و حەمە پاشای جاف و مەحمودی یارەویس و ڕەزا قوڵی خان و غولام شاخانی کوڕی خەسرەو خانی ئەردەڵانی والی سنە)[12] هەبووە

هەروەها بەپێی ئەو سەرچاوە مێژوویانەی کە لەسەرەوە ئاماژەیان پێداوە مەولەوی لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان پەیوەندی دۆستایەتی زۆر بەهێزی هەبووە، ئەمە بەپێی نووسینەکانی (محەمەد مەلا کەریم)[13] وە هەروەها دیوانەکەی شاعیر. [14]

ئەگەر شاعیر پەیوەندییەکی گەرمی لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان هەبوبێت، ئەحمەد پاشا لە ساڵی (1260هـ -1844ز) لەسەر تەختی میرایەتی بابان لاچووە، ئەگەر تەمەنی شاعیر لێک بدەینەوە بەرامبەر ئەم مێژووە، ئەوا شاعیر تەمەنی 38 ساڵ بووە لەو سەردەمەدا، ئەمە کاری کردووە لەسەر مەولەوی یان ئەگەر بۆ لەناوچوونی میرنشینی بابان ئەمەی وتبێت کە لە ساڵی (1850) کۆتایی پێهاتووە، ئەوە تەمەنی شاعیر (44) ساڵ بووە، ئەگەر چی مەولەوی بە ئاشکرا هیچ هۆنراوەیەکی نەتەوەیی نییە، بەڵام ئێمە بۆچوونمان وایە کە ئەو






بەدبەختییەی کە میرنشینە کوردییەکانی تێکەوتووە و یەک لەدوای یەک قڕیان تێکەوتووە و کاریگەری هەبووە لەسەر شاعیر و بەتایبەتیش لەناوچوونی میرنشینی بابان، ئەمەش دەتوانین بیکەین بە بەڵگە بۆ ئەوەی کە مەولەویش شیعری نیشتمانی و نەتەوەیی وتووە، بەڵام بەشێوازی خۆی. هەر وەک چۆن نالی و سالم شیعریان بۆ لەناوچوونی میرنشینی بابان وتووە، ئەمیش بەهەمان شێوە کاری لێ کردووە و شیعری بۆ وتووە.

## وەرزی پایز لە دیدی مەولەوی:

د. ئەوەنوەر قادر دەڵێت: (نیگار کێشانی سەرکەوتوو و هێزی هونەری ئیستێتیکی غەزەلەکانی مەولەوی لەوەدان کە شاعیر لەبری موتیڤە تەقلیدیە سواوەکان هی تازە دەهێنێت و لە چوارچێوەیەکی شیعریی بەرزدا بیری بەرزی فەلسەفی و سۆفیانەیان تێدا دەردەبڕێت.

بەبۆچوونی د. ئەنوەر قادر شاعیرانی تر حەزیان لە چارەی پایز نەبووە و بایەخیان پێنەداوە و درکیان بە جوانی تایبەتی ئەو وەرزە نەکردوە، بەڵام مەولەوی هەندێک تابلۆی سەرکەوتووی لەم مەیدانە هەیە.)[15]

دیمەنەکانی کە لەو غەزەلە پایزانەیدا بە ئەندێشەی بەرزی وێنەی کێشاون، دارستانی گەڵا زەرد

١٢ ڕەئووف عوسمان، ئاسۆیەک بۆ ڕەخنەی ئەدەبی، چاپخانەی وقف الحدیسە، بەغداد، ٢٠١١، ل٧٥

١٣ محەمەد مەلا کەریم، گەشتێک بە ژیان و شیعری مەولەوی دا، مهیرەجانی مەولەوی، چاپخانەی الزمان، ١٩٨٨، ل ٢١٨

١٤ مەلا عیبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل١١

١٥ ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ل١٢١

هەڵگەڕاوەکان، چیا، بای پایزەی دەشت و کێڵگەی هەردو لاپاڵەکانی فەرشی ئاڵتوونی گەڵا وەریوی... پیشان داوە. هەروەها بە خامەیەکی هونەرمەندانە و بە زمانێکی هونەری بەرز کۆچی لە کەژەوە بەرەو پێدەشت بووەوەی کۆچەرانی کوردیان بەرەو کوێستان ڕێگا گرتوویانی نەخشاندووە.

مەولەوی لە وەسفی سروشتی پایزدا وەک وەرزەکانی تر شیعری بۆ نووسیوە و بێبەشی نەکردووە، ئەگەر چی دو غەزەلی بۆ پایز نووسیوە، بەڵام لە هەندێک لە غەزەلەکانی تر گەرچی بۆ مەبەستی تری نووسیوە، کەچی کەرەستەی سروشتی پایزی بەکارهێناوە.

مامۆستا عوسمان هەورامی دەڵێت: (سەرەتای وەرزی خەزانی ڕەنگینە، وردە وردە کزە بای کوێستانەکان هەڵدەکات و پێشەنگی پایز لەسەردادێت. بەرگی سەوز دامێنی سروشت گوڵگون و ڕەنگا و ڕەنگی خەم ئامێزە، سیوەیل هەموو لایەکی ڕشتووە و لوتکەی هونەری بێهاوتای خۆی نواندووە، پەلک و پۆی نەو نەمامەکان کەوتوونەتە لەرزە و بەدەم شەماڵەوە دێن و دەچن و بەرە بەرە هەڵدەوەرێنە دامێنی نەونەمامەکان، بەکاڵای زێڕباو ئەوەندەی تر ڕووی زەمینیان ڕازاندۆتەوە، هەروەها مەولەوی هەر چاو لەڕێیە بەڵکو دۆستی گیانی دەرکەوێت.)[16]

کەواتا ئەمیش هەمان لێکدانەوەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی هەیە بۆ ئەم شیعرە، بەڵام ئەوەی دەرنەخستووە کە بۆ چ کەسێکی وتووە، بەڵام ئێمە دەڵێین ئەگەر شاعیرانی تر بەدیدێکی جوان و مژدە بەخش و گەشبینییەوە بۆ ژیان و سروشت و بەهاریان ڕوانیوە و سروشتی پایزیان بە خەم و خەفەت و دووری و دابڕان وەسف کردووە، لای مەولەوی بۆ هەر چوار وەرزەکە غەزەلەکانی تێکەڵی دەروونی خۆی کردووە، لە هەر چوار وەرزەکە هەر خەم و دابڕانە و هەریەکێکیان نهێنییەکی گەورەی لەخۆیدا شاردۆتەوە، شاعیر دوو پایزە غەزەلی هەیە،

یەکەم:

**چوون وەڵگ شادی من وای دووری لەیل**

**وەیشووم بەرد ئەو هەرد نەورشتەی سوەیل**[17]

لەم شیعرەدا شاعیر پەیوەندی لەنێوان خۆی و درەخت و پایز دروست کردووە، ساردە بای پایز

١٦ عوسمان محەمەد هەورامی، چەن وێنەیەکی گەشتە وەرزی ناخی مەولەوی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ٢٠٠٠، ل٩٢

١٧ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل١٨٠

گەڵای دار دەوەرێنێت و دووری یار گەڵای شادی ئەم ئەوەرێنێت کە ئەمە وێنەیەکی زۆر جوانە، دووری یار وەک ساردی پایزە، بە هاتنی زستان هەموو شتێک جگە لە مرۆڤ دەچێتە قۆناغی سڕ بوون و مردن و لە گەشە دەوەستێت، بە گریمانەیەکی زۆر وەرزی پایزی شوبهاندووە بە تەمەنی پیری و تێپەڕبونی تەمەنی لاوی خۆی. بێگومان لەم شیعرەدا کۆتایی پایزە و سەرەتای زستانە عادەتەن کە مرۆڤ دەگاتە دوا وێستگەی تەمەن بەبێ ویستی خۆی مەرگ پێشوازی لێ دەکات. بەڵام شاعیر مردنەکەی لەبەر دووری لەیلە، واتا لەدوای یار هیچ شتێک بۆ من نەماوەتەوە کە بە ئاواتییەوە بژیم.

لە نیوە دێڕی دووەمدا بە بای وەیشووم دەستی پێکردووە، وەیشووم بایەکی ساردەو لە کۆتایی پایز و سەرەتای زستان دایە. شاعیر باسی دووری لەیل دەکات و لەیل ناوە بۆ ئافرەت وە بۆ پیاو بەکارنایەت، هەروەها لە دیوانەکەی دا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئەم غەزەلەی بۆ دۆستێکی جافی ناردبێت کە لە کوێستانە و نەگەڕاوەتەوە، مەولەوی پایزە غەزەلێکی تری هەیە کە ئەویشی بۆ دۆستێکی لە کوێستان نووسیوە، دەتوانین بپرسین ئایا هەردوو شیعرەکە بۆ تاکێک نووسراوە یان بۆ دوو کەسی جیاواز؟ ئەویش بە بەراورد کردن لەگەڵ شیعری فەسڵی نەو پایزەکەی.

دووەم:

**فەسڵ نەو پایزە تازە کەردەن مەیل**

**شەماڵ هەرزان کەرد ڕەشتەی نەو سوەیل**[18]

لەم شیعرەدا سەرەتای دەستپێکی بەیتەکە گلەیی لە بەختی خۆی ناکات بەڵکو وەکو داواکارییەک وایە، کە ئەوا سەرەتای پایزە بگەڕێرەوە، بە بۆچوونی ئێمە هەردوو شیعرەکە بۆ یەک کەس وتراوە لەبەر ئەم هۆکارانە:

فەسڵی نەوپایز واتا سەرەتای وەرزی پایزە وە لە نیوە بەیتی دووەم دەڵێت (شەماڵ هەرزان کەرد ڕەشتەی نەو سوەیل) ئەگەر بەوردی سەیری کۆتایی دێڕەکە بکەین، ئاماژەی بەوە داوە کە دەڵێت **ڕشتەی نەوسوەیل**، لەناوی سوهیل هاتووە کە گەلاوێژی خۆمانە، هەموومان دەزانین ئەستێرەی

١٨ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل٣٤٨

* بەپێی فەرهەنگی خردی فارسی وشەی ڕشتە ئەگەر ڕۆشتە گۆ بکرێت بە واتای ڕووناکییە، بەڵام ئەگەر بە ڕشتە گۆ بکرێت بەواتای ڕست یا زنجیرە دێت، کە دەشێت بەواتای زنجیرەی ئەستێرەکانی کاکێشان بێت.

گەلاوێژ لە سەرەتای پایز دەردەکەوێت کە هێشتا هەوا گەرمە، بۆیە ئەو بایەی کە هەڵ دەکات لەو وەرزەدا بای شەماڵە کە بایەکی فێنک و لەسەرخۆیە ئەمەش ئاماژەیە بەوەی کە وردە وردە گەڵای دارەکان لێ دەبێتەوە.

مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە دیوانەکەی شاعیردا **ڕشتەی** بەواتای ڕەنگ کراو هێناوە، بەڵام چوونکە شاعیر سوودی لە زمانی فارسی و عەرەبیش وەرگرتووە بۆ هۆنینەوەی شیعرەکانی، ئەوا ناتوانین بڵێین تەنها ئەو واتایە دەدات.

ڕشتە ئەگەر بەواتای ڕست یان زنجیر وەربگرین، ئەشێت شاعیر بە مەبەستی زنجیرەی مانگاکانی ساڵ کە یەک لەدوای یەک دێت هێنابێتییەوە یاخود مەبەستی زنجیرەی ئەستێرەکانە کە لە کاکێشانەکانی ئاسماندایە، هەروەها لەبەراورد کردنی دەستپێکی هەردوو شیعرەکە لەنیوە دێڕی دووەمیان وەیشووم و شەماڵ هاتووە کە ئەم دوو بایە دژی یەکن، شەماڵ بایەکی ئارام بەخش و فێنک کەرەوەیە، بەڵام وەیشووم بایەکی ساردی بێزارکەرە لە کۆتایی پایز و سەرەتای زستان دا هەڵ دەکات.

هەروەها جیاوازی لەنێوان ڕشتەی نەوسیوەل و نەوڕشتەی سوەیل واتاکانیان جیاوازە، چونکە جارێکیان گرنگی بە ڕیزبوونەکە دەدات ئەویش لە نەوڕشتەی سیوەیل واتا ڕیزبوونی تازەی سوەیل جارێکی تریان ڕشتەی نەوسیوەیل واتا ڕشتەی سیوەیلی تازە کە دەرکەوتنی ئەستێرەکەی مەبەستە هەروەها ڕشتەی نەوسیوەیل تازە پایز داهاتووە

چونکە سەرەتاکەی دەڵێت: **شەماڵ هەرزان کەرد** واتا بای شەماڵ بە زۆری هەڵ دەکات.

لە شیعرەکەی تری دا دەڵێت: (وەیشووم بەرد ئەو هەرد نەو ڕشتەی سیویل) وشەی وەیشووم ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پایزێکی زۆر درەنگە و سەرەتای زستانە وە لەبەیتی دووەمی شیعرەکەدا یەک شتی نوسیووە:

**گێجی سەرکاوان جەسەردەی بین کەل**
**بۆ مەدان چوون بۆی بێوەفایی لەیل**[19]

ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە هەردوو شیعرەکە بۆ یەک کەس نووسراوە نەک بۆ دوو کەسی جیاواز.

١٩ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل ١٨٠ و ٣٤٨




## وەرزی زستان لە دیدی مەولەوی:

"مەولەوی ڕەنگە یەکەم شاعیری کورد بێت کە تابلۆی زستانی کوردستانی بەوشێوە هونەرییە بەرزە نەخشاند بێت"[20]

شاعیر بە ئەندێشەیەکی وردەوە وێنەی سروشتی جوان و ڕازاوەی لە وەرزی سەهۆڵبەندان و سەختی ئەو وەرزەمان بۆ دەچنێت. مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس (وا لێکی داوەتەوە کە زستانە تۆف و سەرما کەوتۆتە گەردوون، بەفری باگێژداوی لاشانی شاخە بەرزەکان گەیشتۆتە ئاسمان، باش وەستا قەڵای شاخە بەرزەکان کە دەستی قودرەتی خوایە دەرگای ئەشکەوتەکانی سپی کردووە، هەوای سارد بووە بە زەڕەنگەر و گوارەیەکی چەند جوانی کردە گوێی نەو نەمامەکان و توفی زستان بۆ تەمەشاکردنی باڵای نەومام سەهۆڵی بۆ گرتووە لەجیاتی ئاوێنە و تەمی کرددوە بە چوارشێو.)[21] بەهەمان شێوە سدیق بۆرەکەیی هەمان لێکدانەوەی مامۆستا عەبدلکریمی بۆ ئەم شیعرە کردووە.[22] عوسمان محەمەد هەورامی هەمان بۆچوونی ئەوانەی پیش خۆی پەسەند کردووە و وەکو ئەوان لێکدانەوەی بۆ کردووە.[23]

هەروەها دکتۆر ئەنوەر جاف دەڵێت: "ئەم وێنانە وێنەی ناوازە و نوێن و وێنەی لە ژیان هەڵقولاون و بەشێوەیەکی هونەری و خامەی نیگارکێشێک کێشراون."[24] ئەوا زستانە و گەردەلوولی بەفری لاپاڵەکان خول دەخوات و بەرزدەبێتەوە و بەشێوەیەک کە سەر لە ئاسمان دەسوێت، شاعیر لەم شیعرەدا وێنەیەکی نەوەستاوە و بە جووڵەی کێشاوە کە سروشت و جوانیەکەی دەخاتە ئەندێشە ڕۆمانسیەکانی خوێنەرەوە، جوانترین خشڵەکانی هێناوە وەک گوارەی کردوەتە گوێی نەونەمامەکانەوە بۆ دیتنی باڵای خۆشەویستەکەی سەهۆڵ ئاوێنەی بۆ گرتووە و تەموو مژیش خۆی کردووە بە چارشێو بۆی. ئەگەر تەنیا ڕوکەشی شیعرەکە ببینین شاعیر بوکێکی ناوازەی دروست کردووە لە سروشتی زستاندا، بەڵام ئاخۆ

٢٠ ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ل١٢٥
٢١ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل ٢٩٢
٢٢ سدیق بۆرەکەیی، مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی چهر تبریز، ١٣٧٠ هەتاوی، ل٥٢٠
٢٣ عوسمان محەمەد هەورامی، چەن وێنەیەکی گەشتەوەرزی ناخی مەولەوی، میهرەجانی ٢٠٠٠، ل٧٩
٢٤ ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ل١٢٦

گەوهەری شاراوەی ئەم شیعرە چییە؟ ئەو وشانە چین کە مەولەوی وەک هێما لەناو شیعرەکەیدا بەکاری هێناوە؟ بۆچی شاعیر بووکێکی لەو وەرزە دروست کردووە، ئایا بووکی سەردەمی مەولەوی پۆشاکەکانی سپی بووە یان ئاڵ و واڵا بووە؟ زستان لای شاعیرانی تر چ واتایەکی هەیە؟
بەبۆچوونی ئێمە بووکی سەردەمی کۆن پۆشاکیان ئاڵ و واڵا بووە و تارایان سوور بووە. هەروەها لەوانەیە زستان لای زۆربەی شاعیران کۆتایی تەمەن و پیری و لەناوچوون و مردن و دابڕان بێت، بەڵام لە لای شاعیرانی تر واتا و فۆرم یەکیان نواندووە، بەڵام لە لای مەولەوی دوو شتی زۆر جیاواز لە یەکتری بەکارهاتووە، ڕووکەشەکەی وەسفێکی نایابی جوانە، بەڵام ناوەڕۆک واتایەکی قووڵی جیاوازی لەناو خۆیدا حەشارداوە.
گەوهەرەکانی ئەم غەزەلە (بەفر، سەهۆڵ، بووک، چیا، زێڕ، گوارە، گوێ، چارشێو، تەم، ئاوێنە، ئەشکەوت.. هتد.)
بە هەموو ئەو کەرەستانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێ دا وێنەی جوان و دانسقەی دروست کردووە، با بزانین ناوەڕۆکی شاراوەی ئەم شیعرە چییە؟

**زوسانەن وەی ڕەنگ وەگەردوون یاوەن**
**گێجیای لووڵ گێج کلێلە کاوان**
**بەناباشی بورج بەرزە دیارەن**
**سفیدکاری کەرد تاقچەی موغاران**[25]

چەندین بۆچوون هەیە لەسەر ئەم شیعرە کە بریتین:
1. باسی چیا دەکات، ئەگەر چیاکان بە مرۆڤ بشوبهێنین ئەوا ئەشکەوتەکان دڵی مرۆڤەکانە کەواتە ئەگەر چیاکان سپی پۆش بکرێن بە واتای کفن دێت و دڵی مرۆڤەکانیش لە لێدان کەوتووە.
ئەم بۆچوونانەش بەپێی ئەم دوو دێڕەی خوارەوە لێکدانەوەمان بۆ کردووە:

**چ شیرین زەرگەر تۆف هەوای سەرد**
**گۆشوارە نە گۆش نەونەمامان کەرد**
**پەی نیگای باڵای مەحبووب بێ گەرد**
**یەخ ئاینەی گرت تەم چارشێو ئاوەرد**[26]

2. باسی مردنە سەرەتای شیعرەکە، بەڵام مردنی چ کەسێک کە بەم شێوە جوانە وەسفی کردووە، شاعیر کفنی مردووەکەی کردووە بە جلی بووکەکە و ڕەنگی سپی هێمای کفنە، وشەی نەونەمام بۆ باڵای ئەو ئافرەتە، هەروەها گوارە کە بۆ ژن بەکاردێت و چارشێو بە واتای تارای بووکەکە بەکارهاتووە، کەواتە مردوو چ ژن بێت یان پیاو، بەبێ جیاوازی کفن دەکرێت، بەڵام لە وێنەی ئەم شیعرەدا شاعیر کەسی مردووی بە بووک چواندووە، ئەگەر کەسی مردوو پیاو بوایە هەرگیز ئەو وێنەیەی بۆ دروست نەدەکرد، چونکە شاعیر بەبێ هۆ ئەم وێنە جوانەی بۆ دروست نەکردووە، ئەو کەسەی کۆچی دوایی کردووە ئافرەت بووە بۆیە مەراسمی کفن کردنی بەم شێوەیە وێنە کردووە، هەروەها دەتوانین بیشوبهێنین بە ئافرەتێکی پاک کە دەمرێت و دەبێتە حۆریەکی بەهەشت و فریشتەکان پێشوازی لێدەکەن و کۆشکی سپی و ڕازاوە و ئاوێنە بەندیان بۆ ئامادە کردووە تا وەکو لەو کۆشکە نیشتەجێ بێت.





٢٥ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل٢٩٢
٢٦ مەلا عیبدولکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەولەوی، ل٢٩٢



# مەولەوی تاوەگۆزی
# بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە کتێبی کوردیدا
# ١٩٣٥- ٢٠١٠



**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**
Bwar_n@yahoo.com

پێشەکی

زۆرێک لە خوێنەران ئاگادارن، چەند ساڵێکە کار لە پڕۆژەیەکدا دەکەین و لەبەر چەند هۆکارێک، نەتوانراوە هەموو وردەکارییەکانی پڕۆژەکە تەواو بکەین، لەگەڵ ئەمەشدا، توانراوە چەند بەرهەمێکی لێ بڵاوبکەینەوە، بەتایبەت لە ژمارەکانی ڕۆڤاردا، هەندێ بیبلیۆگرافیای تایبەتمان ئامادە کردووە... ئەمە جگە لە چەند بیبلیۆگرافیایەکی تر، کە وەک سیپارە (نامیلکە) یان پاشکۆ، بڵاوبوونەتەوە.

بەپێی توانا، زۆرترین وردەکاریمان لەگەڵ ئەم پرۆژەیەدا کردووە و زۆریش پێوەی ماندووبووین، بێ هیچ گومان و چەند و چوونێک، هێشتا کەموکورتی هەیە، کە ئەمەش سروشتێکی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیایە، بەتایبەت لە وڵاتێکی وەک کوردستان و لەپێناوی کتێبی کوردیدا.

ئەم پڕۆژەیە، جگە لە کتێب بە زمانی کوردی –لە سەرەتاوە تاکو ساڵی ٢٠١٠–، کتێبی نووسراوی بە هیچ زمانێکی دیکە لەخۆنەگرتووە، هەروەها، گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنیا ئەوانەی گرتووەتەوە کە

وەک (کتێب)، دووبارە چاپ کراونەتەوە، لە هەمان کاتدا، پڕۆژەکە تەنیا ئەو کتێبانەی کۆکردووەتەوە کە لەبارەی (کورد و کوردستان) نووسراون.
لە بەرگی سێیەمدا کە تایبەتە بە (ئەدەبی کوردی)، چیرۆک و ڕۆمان و دیوانی هیچ شاعیرێکمان وەرنەگرتووە؟ لەکاتێکدا هەموو ئەو لێکۆڵینەوە و نووسین و بابەت و وتارانە... تاد، وەرگیراون، کە پەیوەندییان بە: شیعر، ژیان، سەردەمی... شاعیرانی کوردەوە هەیە، چونکە کاتێک لێکۆڵینەوە لەبارەی شاعیر یان چیرۆکنووسێکی کوردەوە دەکرێت، تارادەیەک بەرهەمەکانیان دیارە و کارئاسانییەکە ئەمەیە کە ئایا چی و کێ و کەی و چۆن؟ لەبارەیانەوە نووسراوە...
لەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەروەک تەواوی پڕۆژەکە، کتێبەکان بەپێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بەپێی (تیپ)ـە کوردییەکان ڕیزکراون. هەروەها بەپێچەوانەی بیبلیۆگرافیا سەرەکییەکە، ناونیشانی کتێبەکانیش بەپێی ڕێنووسی ئێستا نووسراونەتەوە.
بە پێویستمان نەزانی هەموو ئەو سەرنج و تێبینییانە بنووسینەوە، کە لە ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیاکانی پێشتردا ئاماژەمان پێکردوون، لەپێناوی زانیاریی زۆرتر لەبارەی پڕۆژەکە و شێوازی بیبلیۆگرافیاکە، خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ژمارەکانی پێشتری (ڕۆڤار)، هەروەها: بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی- بەرگی یەکەم: مێژوو و جوگرافیا، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، چ(حاجی هاشم)، ٢٠١٤.

هێما بەکارهاتووەکان
چاپ: نۆرەی چاپە واتە چاپی یەکەم و دووەم
چ: چاپخانە
ش: شوێن
و- وەزارەت
ژس: ژمارەی سپاردن
س: ساڵ
ل: لاپەڕە
ق: قەوارە (بە سانتیمەترە و «پانی»ی پێش «درێژی»ی نووسراوە)
؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە
کۆڕ: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی (عێراق و کورد)

## یەکەم بیبلیۆگرافیا
## کتێبی نووسراو لەبارەی (مەولەوی تاوەگۆزی)
## یەوە ١٩٣٥- ٢٠١٠

١. دیوانی مەولوی و ڕۆحی مەولەوی- پێکەوە/ جلدی یەکەم
کۆکردنەوە و گۆڕینی بۆ کرمانجی ناوەڕاست: پیرەمێرد
چاپ: یەکەم، چ: سلێمانی، ش: سلێمانی، ژس:؟، س: ١٩٣٥، ل:١-٢٣١، ق:١٥×٢٢
ناوەرۆک:
دیباچە- دیوانی مەولەویمان چۆن چاپ کرد؟/ مەولەوی کێیە؟/ هۆنراوەکان.../ ئادەمیزاد نەمرێ بە هەموو دڵخوازێک ئەگات.

٢. دیوانی مەولوی و ڕۆحی مەولەوی- پێکەوە/ جلدی دووەم
کۆکردنەوە و گۆڕینی بۆ کرمانجی ناوەڕاست: پیرەمێرد
چاپ: یەکەم، چ: ژیان، ش: سلێمانی، ژس:؟، س: ١٩٣٥، ل:٢٣١- ٤١٠+ ٩، ق:١٥×٢٢
ناوەرۆک:
هەوەسکاری/ هۆنراوەکان.../ کۆتاییەکی بێ ناونیشان/ فەهرەستی هەردوو بەرگ.



٣. مەولەوی- شای شاعیرانی لاهوت و زانایی و خۆشەویستیی کورد لە چەرخی نۆزدەهەمدا
نووسین: أ.ب.هەوری
بە یاریدەی وەزارەتی کاروباری ژوروو- بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی گشتیی کوردی چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: کاکەی فەللاح، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ١٩٧٢، ل:٦٥، ق:١٤×٢٢
ناوەرۆک:
سەرەتا/ یەکەم: مەولەوی کێیە؟/ دووەم: وردەکاری و گوزارەی قووڵ/ سێیەم: مەولەوی و خاتوو عەنبەری خێزانی/ چوارەم: مەولەوی و فەلسەفە/ پێنجەم: مەولەوی و هۆنراوەی چیرۆکی/ شەشەم: مەولەوی و مەی و نەی/ حەوتەم: مەولەوی و هەڵپەرکێ و ڕەشبەڵەک/ سەرچاوەکان.

٤. مەولەوی و سروشت
نووسین: عەلی شێخ عومەر قەرەداخی

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد
چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ١٦٧٢، س: ١٩٧٨، ل:٤٤، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک:
لێکۆڵینەوەیەک لەسەر (سرووشت) لەناو شیعرەکانی (مەولەوی)دا/ فەرهەنگۆک.

٥. هەڵبژاردەیەک لە ((عەقیدە مەرزییەی))ی مەولەوی
لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە: بابەعەلی شێخ عومەر قەرەداخی
بە یارمەتی ئەمانەتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: ئیرشاد، ش: بەغدا، ژس: ١٣٢٦، س: ١٩٨٥، ل:١٥٨، ق:١٧×٢٣
ناوەرۆک:
هەندێ ناونیشانی وەک: کورتەیەک لە ژیانی مەولەوی/ خولیای ئەم لێکۆڵینەوەیەم چۆن کەوتە سەر؟/ موعتەزیلەکان چۆن سەریان هەڵدا؟/ خولی مەولەوی لە زانیاریی کەلامدا/ پێڕستی کتێبی (العقیدة المرضیه)/ بنەڕەتی هەڵبژاردنی نموونەکان/ سەرچاوەکانی مەولەوی و سووڕانەوەی لەگەڵ ڕاستیدا/ هاتنە سەر مەبەست و شێوازی دوانی مەولەوی لە هۆنراوەکەیدا.../ پێڕست.

٦. میهرجانی مەولەوی
ئامادەکردن: محەممەدی مەلا کەریم
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی- گۆڤاری ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ: الزمان، ش: بەغدا، ژس: ٧٥١، س: ١٩٨٩، ل:٢٥٦، ق:١٦×٢٤
ناوەرۆک:
پێشەکی: مستەفا نەریمان/ بەرنامەی میهرەجانی مەولەوی/ وتاری مامۆستا موسڵح مستەفا ئەلجەلالی/ سۆفیگەریی مەولەوی: ئەمین نەقشبەندی/ مەولەوی و عەقیدەکانی: فاتح عەبدولکەریم/ گەشتێک بە ئاسۆی خەیاڵی مەولەویدا: محەممەد ئەمین حەبیب/ شاعیرێتیی مەولەوی: ڕەئووف عوسمان/ مەولەوی بەرهەمی و شتێک دەربارەی سروشت: د.عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ/ تاوێک لەگەڵ ستایش و فەلسەفەکانی مەولەویدا: خەسرەو جاف/ کێشەی پاکژبوونەوە لە شیعری مەولەویدا: ئومێد ئاشنا/ بۆ مەولای شاعیران مەولەوی: حەسیب قەرەداخی/ هەندێ لە سەرگوزەشتە خۆشەکانی مەولەوی: کامیل ژیر/ لە یادی میری شاعیران مەولەویدا: عوسمان محەممەد هەورامی/ باسکەمەلەیەک لە نێو دەریای شیعری مەولەویدا: مەحموود زامدار/ گەشتێک بە ژیان و شیعری مەولەویدا: محەممەدی مەلا کریم.




٧. لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی ١٨٠٦-١٨٨٢ – (بە دیالێکتی گۆرانی)
نووسین: ئەنوەر قادر محەممەد
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ستۆکهۆڵم، ژس: ؟، س: ١٩٩٠، ل:٢٨٣، ق:١٤×٢٠
ناوەرۆک:
ناوەرۆک/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: گۆرانەکان- زمان و ئەدەبیات/ بەشی دووەم: ژیان و بەرهەمی ئەدەبی و زانستیی مەولەوی/ بەشی سێیەم: دیوانی مەولەوی- ژانر- بابەتی لیریکی و لایەنە هونەری و ئیستێتیکییەکانی/ بەشی چوارەم: سەرچاوەکانی شیعری مەولەوی و تەئسیری لیریکای شیعری کوردی/ سەرئەنجام/ سەرچاوەکان.
تێبینی: ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ISBN: 4-0288-630-91 وەرگرتووە.

٨. ڕیسالەی عیشق لە مەولەوی ناسیدا- پەیجۆییێک لە ڕوانگەکانی بیروباوەڕی عارف و شاعیری ناوداری کورد سەیدا عەبدولڕەحیمی مەولەوی تاوەگۆزی (قدس سره الشریف) لەگەڵ شەرحی گوڵچنینێک لە غەزەلەکانی
نووسین: سۆران سنەیی
لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی- ئینتیشاراتی سەلاحەددینی ئەییووبی
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ورمێ- ئێران، ژس: ؟، س: ١٣٧٠ (١٩٩١)، ل:٥٨٦، ق:١٦×٢٢
ناوەرۆک:
پێش وتار/ پێرستی پارچە شیعرگەلی شەرحکراو/ پێرستی بابەتەکان/ هەندێ بابەتی وەک: ناسنامەی مەولەوی/ کارنامەی زانستیی مەولەوی/ ئەو ساڵ و شوێنە وا تێیدا کۆچی دوایی ئەکات/ ئەو

شوێنە وا تەرمەکەی بە سینەی خاک سپێردراوە/ بەرهەمە ئەدەبی و ئایینییەکانی مەولەوی/ کارەساتە ناخۆش و دڵتەزێنەکانی ژیانی مەولەوی/ بابەتەکانی هۆنراوەگەلی مەولەوی/ مەولەوی و تەریقەت/ خانەقا- سۆفی/ چلەکێشی یا چلەنشینی/ پەیوەندی مەولەوی لەگەڵ پیرەکانی/ مەولەوی و فەلسەفەی ڕەسەنایەتی و ئیسالەتی وجوودی خوا/ چەند سەرگوزشتە و بەسەرهاتی ژیانی مەولەوی/ نیشانە کورتکراوەکان/ شادیگەرایی و شادی دۆستی لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ پارێزەرانی تەجرەبە و زانستی پێشینان لە شیعری مەولەویدا/ عیشق لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ خەم و شادی لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ فەلسەفەی ژیان لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ جیهان و ویژدانی ئاگاداری مرۆڤایەتی لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ بەهار و سروشت و ئینسان لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ پێکانی دوو یان چەن نیشانە بە تیرێک لە شیعری مەولەویدا/ ڕەند و ڕەندیی لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ جوانپەرستی لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ نزیکی عاشق و مەعشووق لە ڕوانگەی مەولەوییەوە/ هەور لە فۆلکلۆر، وە هەروەها لە شیعری مەولەویدا/ قەقنەس لە شیعری مەولەویدا/ وەسفی شایی و زەماوەند لە شیعری مەولەویدا/ خشڵی ژنان لە شیعری مەولەویدا/ ئەلسەت و ئەزەل لە شیعری مەولەویدا/ ناسک خەیاڵی لە شیعری مەولەویدا/ ڕاو و شکار و جۆرەکانی لە کوردستاندا/ قافڵە و کاروان لە کوردەواریدا/ مەولەوی و مۆسیقای عیرفانی/ سازەکان یا ئامێرەکانی مۆسیقا/ مەولەوی و جوانکارییەکانی شیعری/ ڕەسەنایەتی هونەری لە شیعری مەولەویدا/ پاش وتار/ چەند وشەیەکی پێویست: د.کوردستان موکریانی/ پێڕستی بەرهەمەکانی نووسەر.

٩. ڕۆحی مەولەوی
کۆکردنەوە و گۆڕینی بۆ کرمانجی ناوەڕاست: پیرەمێرد
پێشەکی و سەرپەرشتی چاپکردنەوە: محەممەد حەمەباقی
لە بڵاوکراوەکانی ئینتیشاراتی محەمەدی لە سەقز
چاپ: سێیەم، چ: ؟، ش: سەقز- ئێران، ژس:، س: ١٩٩٣، ل:٢١٥، ق:١٤×٢١
ناوەڕۆک:
پێشەکی: محەممەد حەمەباقی/ هەمان ناوەڕۆکی هەر کتێبی ژمارە ١ و ٢ی هەیە.
تێبینی: چاپی دووەمی ئەم کتێبەمان دەست نەکەوتووە.

١٠. مەولەوی- لێکۆڵینەوە، پشکنین، شیعری
نووسین: حەکیم مەلا ساڵح
لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی- ئینتیشاراتی سەڵاحەددین
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ورمێ- ئێران، ژس: ؟، س: ١٣٧٦ (١٩٩٧)، ل:٢٣١، ق:١٧×٢٤
ناوەڕۆک:
پێڕست/ پێشەکییەکی کورت/ هەندێ بابەتی وەک: باری ژیانی مەولەوی/ سەرچاوەکانی هونەری شیعری مەولەوی/ کارتێکردنی مەولەوی لەسەر شاعیرانی هاوچەرخی و دوای خۆی/ مەولەوی و ڕەخنەی ئەدەبی/ ئەو هەوڵانەی کە بۆ خزمەتی بەرهەمەکانی مەولەوی دراوە/ ئەو سەرچاوانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە/ پشکنین/ کۆمەڵێک لە هۆنراوەکانی مەولەوی و شیکردنەوە و باسکردنیان...

١١. زوبدەی عەقیدە- دیاری میهرەجانی مەولەوی
نووسین: مەولەوی
ئامادەکردن و ڕێنووسکردن: حەمەساڵح حاجی مەلا محەممەد گەلاڵە
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە- و. ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژس: ٤٧٦، س: ٢٠٠٠، ل:٣٢١، ق:١٥×٢٠
ناوەڕۆک:
پێشەکی: عەبدوڵڵا قەرەداخی/ پێشەکی ئامادەکار/ زوبدەی عەقیدە (هەر دوو لاپەڕەیەکی بەرامبەر یەکتر یەکیان وێنەی لاپەڕەیەکی دەستخەتەکەیە و ئەوی دیکەیان ساخکردنەوەکەیەتی، کە بە پەراوێزیش شیکردنەوە و لێکدانەوەیان بۆ کراوە...)

١٢. میهرەجانی مەولەوی
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە- و. ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژس: ٤٧٦، س: ٢٠٠٠، ل:٣٢١، ق:١٥×٢٠
ناوەڕۆک:
ناوەڕۆک/ زوبدەی عەقیدە و میهرەجانی مەولەوی:

محەممەد عەبدولکەریم سۆڵەیی/ پێشەکییەک: د.عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ/ مەولەوی- ژیان و بەرهەمی: محەممەدی مەلا کەریم/ دوو وشەی تر بۆ مەولەوی: د.عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ/ بۆ میهرەجانی شاعیری گەورەمان مەولەوی لە سلێمانی: د.ئەنوەر قادر جاف/ چەند وێنەیەکی گەشتەوەرزی ناخی مەولەوی: عوسمان محەممەد هەورامی/ دەرگایەک بۆ تێگەیشتن لە هۆنراوەکانی مەولەوی: ڕەئووف عوسمان/ هێماسازی لە ناو شیعرەکانی مەولەویدا: حەمەکەریم هەورامی/ چەند لایەنێکی کۆمەڵایەتی لە ژیان و شیعرەکانی مەولەوی تاوەگۆزیدا: د.ئیبراهیم قادر/ حەکیم مەولەوی کورد: محەممەد ساڵح ئیبراهیمی (شەپۆل)/ بۆ میهرەجانی مەولەوی: ڕەحیم لوقمانی/ مەولەوی و گەرمەسێر: ئیبراهیم باجەلان/ ساتێ لەگەڵ مەولەویدا: حەمەڕەشید ئەمینی.

١٣. میهرەجانی مەولەوی
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە- و. ڕۆشنبیری
چاپ: دووەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژس: ٤٦٧، س: ٢٠٠٠، ل:٢٧٩، ق:١٦×٢٢
ناوەرۆک:
هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە بڕوانە کتێبی پێشتر.
تێبینی: ئاماژە بە چاپی دووەم نەکراوە، تەنیا لە لاپەڕە ٢دا، تێبینییان بۆ نووسیوە کە لەبەر بایەخی کتێبەکە، چاپیان کردووەتەوە.

١٤. لیریکای شاعیری گەورەی کورد (مەولەوی ١٨٠٦-١٨٨٢) – بە دیالێکتی گۆرانی
نووسین: ئەنوەر قادر محەممەد
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: ؟، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ٢٧٢، س: ٢٠٠١، ل:٢٨٣، ق:١٤×٢٠
ناوەرۆک:
پێشەکی/ بەشی یەکەم: گۆرانەکان، زمان و ئەدەبیان/ بەشی دووەم: ژیان و بەرهەمی ئەدەبی و زانستیی مەولەوی/ بەشی سێیەم: دیوانی مەولەوی، ژانر، بابەتی لیریکی و لایەنە هونەری و ئیستێتیکییەکانی/ فەرد/ دووبەیت/ غەزەل/ وەسپی لیریکی/ لاواندنەوە و شین/ لیریکای شەخسی/ شیعری موناسەبەت/ شیعری ئایینی/ مەی/ نامەی شیعری/ هەندێ لە خەسیەتە هونەرییە تایبەتییەکانی لیریکای مەولەوی/ بەشی چوارەم: سەرچاوەکانی شیعری مەولەوی و تەئسیری لیریکای لە شیعری کوردی/ مەولەوی و شیعری بە دیالێکتی گۆرانی نووسراو/ مەولەوی و شیعری کلاسیکیی فارسی/ مەولەوی و سۆفیزم/ یەکێتیی بوون/ مەولەوی و شاعیرانی دیالێکتی کرمانجیی خواروو/ سەرئەنجام/ سەرچاوەکان.
تێبینی: چاپی یەکەم نووسراوە و دووەمە، چاپی سێیەمیشی هەیە کە لە ناوەرۆکدا کەمێک جیاوازن، کە ناوەرۆکی چاپی سێیەم، بۆ ئەم چاپە دانراوە.

١٥. مەولەوی
نووسین: محەممەدی مەلا کەریم
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٣٠٦، س: ٢٠٠١، ل:٦٢، ق:١٤×٢١
ناوەرۆک:
سەرەتا/ ژیانی مەولەوی/ بەرهەمی مەولەوی/



دیوانی مەولەوی/ کۆڵینەوە لە شیعری مەولەوی/ شیعری کوردیی مەولەوی/ بابەتی شیعری سۆزی بە کوردیی مەولەوی/ سۆنێت لە شیعری مەولەویدا/ ژیانی مەولەوی پێوەندی شیعری بە ژیانییەوە/ پەراوێزەکان/ ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی (دەزگای ئاراس).

١٦. لێکۆڵینەوەیەک لەسەر دیوانی مەولەوی
نووسین: محەممەد حیجازی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری گۆران
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سنە، ژس: ؟، س: ١٣٨٢ (٢٠٠٣)، ل:٧٣، ق:١٤×٢٠
ناوەڕۆک:
بەشی یەکەم: لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو چل و پێنج شیعرە کە بە ناوی مەولەویەوە کاک حەکیم هێناویەتی/ بەشی دووەم: لێکۆڵینەوە لەسەر هەڵەکانی دیوانی مەولەوی/ بەشی سێیەم: باسێک لەسەر دیوانی مەولەوی (ص.بۆرەکەیی)/ بەشی چوارەم: باس لەسەر دیوانی مەولەوی (م.ئەلف-ئەردەڵانی) و کەڵک و یارمەتییەکانی.
تێبینی: ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ١- ٢٧٧٧- ٠٦- ٩٦٤:ISBN وەرگرتووە.

١٧. لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی –




بە دیالێکتی گۆرانی (هەورامی)
نووسین: ئەنوەر قادر محەممەد
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: سێیەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ٢٠٠٧، ل:٢٨٣، ق:١٧×٢٣
ناوەڕۆک:
بۆ ناوەڕۆکی ئەم کتێبە، بڕوانە کتێبی ژمارە ١١

١٨. مەولەوی و تەقینەوەی زمان
نووسین: حەکیم مەلا ساڵح
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٥٠٥، س: ٢٠٠٨، ل:١٥٢، ق:١٤×٢٢
ناوەڕۆک:
سەرەتایەک/ تەوارودی خەواتر لە نێوان مەلای جزیری و مەولەویدا/ مەولەوی و تەقینەوەی زمان/ مەولەوی و ئاوڕدانەوەی کەلەپوور/ مەولەوی و پیاچوونەوەیەکی وتارەکەی کاک محەممەدی مەلا کەریم/ مەولەوی و شاعیری وێنەی جوان/ واتای ڕاستەقینەی هەندێ وشە لە دیوانی مەولەویدا/ چەند نامەیەکی مەولەوی بە عەرەبی/ پاشکۆ/ پێڕست.

١٩. ئەدەبیاتی نامە و نامە لای مەولەوی تاوەگۆزی
نووسین: حەسەن نازدار
چاپ: یەکەم، چ: سایە، ش: سلێمانی، ژس: ١٥٠٥، س: ٢٠١٠، ل:١١٨، ق:١٥×٢٠
ناوەڕۆک:
دەستپێک/ نامە چییە؟/ هەندێک بابەتی وەک: ڕێگاکانی گەیاندنی نامە/ جۆرەکانی نامە/ نامە لە ئەدەبیاتی کوردیدا/ نامە لای هاوەڵانی مەولانا/ نامە لای مەولەوی تاوەگۆزی/ نامە عەرەبییەکانی مەولەوی/ سەرچاوەکانی ئەم نووسینە/ پاشکۆ: نامەی پێغەمبەر (د.خ)/ مەزاری مەولەوی.

٢٠. دیداری مەولەوی
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان- بەڕێوەبەرێتی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژس: ١٨٠٥، س: ٢٠١٠، ل:٢٩٩، ق:١٥×٢٠

ناوەرۆک:
پێرست/ جوانی ناسینی شیعرەکانی مەولەوی: کەلسووم عوسمان پوور/ گەڕان بە دوای شیعرەکانی مەولەویدا: د.عەبدولوەهاب عەبدوڵڵا/ کارێکی نوێ بۆ مەولەوی: محەممەد عەلی قەرەداخی/ مەولەوی وێنەی خودئاگایی: عادل محەممەد پوور/ لە (سەر شاتە)ی ڕەقەنەوە بۆ (وەکناباد)ی ئەشق: جەلیل عەباسی/ خوێندنەوەی مەولەوی وەک شاعیرێکی...: کەمال غەمبار/ مەولەوی شاعیری ئازار و خەمە: حەمەکەریم هەورامی/ چەمکی عەشق لە دونیابینی مەولەویدا: ڕەفعەت موڕادی/ کاریگەری مەی و هەرمانۆ ساقی لاوی مەولەوییەوە: کوورش ئەمینی/ کاریگەری شاعیرانی ڕابردوو لەسەر مەولەوی و...: حەمەڕەشید ئەمین/ مەولەوی شاعیر و دانا و زانا و...: د.عاسی عەبدولکەریم/ لێکدانەوەی سەرپێیی لەسەر چەند دێڕێ: مەلا موئمین نووری/ کورتەیەک لەسەر مەولەوی: نادر نەقشبەندی/ خوێندنەوەی خەسارشناسی لە شیعری مەولەویدا: ڕەئووف مەحموود پوور/ سیمفۆنیایەک بۆ هۆرامان: محەممەد عەبدە ئەمین/ مەولەوی و بنەماڵەکانی عیلم و زانست: سەباح حسەینی/ چەند بەڵگەنامەیەک.

٢١. کێشەی پاکژبوونەوە لە شیعرەکانی مەولەویدا- لێکۆڵینەوە
نووسین: ئومێد ئاشنا
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: ؟، ل:١١، ق:١٥×٢٠
ناوەرۆک:
هیچ ناونیشانێکی تێدا نییە و بەم شێوەیە دەست پێدەکات: لە کورتە باسێکی وەهادا، جێگای ئەوە نابێتەوە کە پێناسە جۆربەجۆرەکانی سۆفیەتی و بابەتی سۆفیەتی خۆی بنووسین، چونکە لەم بارەیەوە سەرچاوەی دەوڵەمەند و پوخت و زۆر، ڕاستەوخۆ دێینە سەر کێشەی پاکژبوونەوە و ڕەنگدانەوەی لە شیعرەکانی مەولەویدا.../ سەرچاوەکان.

٢٢. مەولەوی و پەخشانی کوردی
ئامادەکردن: حەکیم مەلا ساڵح




چاپ: یەکەم، چ: سەنتەری کوردۆنیا، ش: سلێمانی، ژس: ١٦٨٩، س: ٢٠١٠، ل:٧٨، ق:١٤×٢١
ناوەرۆک:
پێشەکی/ قوتابخانەی شیعری گۆرانی/ هونەر بەخشین بە شێوەزاری جاف/ چەند هۆنراوەیەک/ فەرهەنگۆک.

٢٣. نامەی شیعری لە شیعرەکانی (مەولەوی)دا
نووسین: دارا محەممەد عوسمان
لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژس: ١٦٩٠، س: ٢٠١٠، ل:٢٥٢، ق:١٥×٢١
ناوەرۆک:
پێرست/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: تەوەری یەکەم: نامەی شیعری لە ئەدەبی گەلاندا/ تەوەری دووەم: نامەی ئاسایی و نامەی شیعری/ بەشی دووەم: تەوەری یەکەم: ژیان و بەرهەمەکانی مەولەوی/ تەوەری دووەم: ئەو نامە شیعرییانەی بۆ مەولەوی هاتوون/ تەوەری سێیەم: لە یەکەم نامەوە بۆ دوانزەیەم نامەی هەمووی بۆ (مەلا محەممەدی مینبەری) بە زمانی عەرەبی نووسیوە، چەند نموونەیەک لەو نامانە/ بەشی سێیەم- تەوەری یەکەم: نامەکانی مەولەوی بە زمانی فارسی/



تەوەری دووەم: هەژمارکردنی نامەکانی بە زمانی فارسی/ تەوەری سێیەم: ڕیزبەندی نامەکانی (ا-ی) کە ژمارەیان ٩٠ نامەی شیعرییە/ پەراوێزەکان/ سەرچاوەکان.

## دووەم بیبلیۆگرافیا
## پێڕستی (مەولەوی تاوەگۆزی) لە ناوەرۆکی کتێبی کوردیدا ١٩٣٩- ٢٠١٠

١- تاریخی سلێمانی وە وڵاتی- لە دەوری زۆر قەدیمەوە تا ئەووەلی ئیحتیلال (١٩١٨م)
نووسین: محەممەد ئەمین زەکی، چاپ: یەکەم، چ: النجاح، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٣٩، ل:٢٩٤، ق:١٦×٢١
ناوەرۆک: مەشاهیری وڵاتی سلێمانی...: مەلا عەبدولڕەحیم (مەولەوی)

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی- مێژوو، ئەدەب، زانیاری
نووسین: عەلائەدین سەجادی، چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٥٢، ل:٦٣٤، ق:١٥×٢٠
ناوەرۆک: دەوری دووەم لە ئەدەبی کوردی/ هۆنراوە (شیعر)/ هەڵبەست لە کورددا/ بۆچ هۆنراوە بە شێوەی هەورامی وتراوە؟: مەولەوی.

٣- ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی
نووسین: عەلائەدین سەجادی، چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٦٨، ل:٣٤٨، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: وردبوونەوەیەک لە هۆنراوەی کوردی: مەولەوی.
تێبینی: لەسەر بەرگ ساڵی ١٩٦٨ و لە یەکەم لاپەڕەدا ساڵی ١٩٦٧ نووسراوە؟

٤- باخچەی شاعیران- بەسەرهات و هەڵبەستی ٤١ بوێژی کورد
کۆکردنەوە و لەسەر نووسین: عەبدولعەزیم ماوەتی - عەبدولقادر ساڵح، چاپ: یەکەم، چ: ژین، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ١٩٧٠، ل:١٦٣، ق:١٥×٢٢
ناوەرۆک: کورتەی ژیان و نموونەی بەرهەمی ٤١ شاعیری کورد...: مەولەوی ١٨٠٦- ١٨٨٢

٥- دەقەکانی ئەدەبی کوردی
نووسین: عەلائەدین سەجادی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ١١٩٩، س: ١٩٧٨، ل:٢٢٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەهۆی باسکردن لە دەقی ئەدەبییەوە/ مەولەوی/ مەولەویی هۆنەر/ مەولەویی سۆفی.

٦- پێناسی بەشێکی شاعیرانی کورد- بەسەرهات و ژیانی (٤٢) شاعیری ناوداری کوردە
نووسین: ئەسعەد عەدۆ، چاپ: یەکەم، چ: ئەلحەوادیس، ش: بەغدا، ژس: ٥١٩، س: ١٩٨٠، ل:٥٥، ق:١٥×٢٢
ناوەرۆک: مەولەوی.

٧- تێکستی ئەدەبیی کوردی- بەشی دووەم/ زانستگای سلێمانی کۆلیجی ئاداب بەشی زمانی کوردی.
نووسین: د.محەممەد نووری عارف، لە بڵاوکراوەکانی زانکۆی سلێمانی، چاپ: یەکەم، چ: ز-سلێمانی، ش: سلێمانی، ژس: ٦٩٣، س: ١٩٨١، ل:٣٥٨، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: تێکستی هۆنراوەی کۆن بە شێوەی گۆرانی/ مەولەوی.

٨- یادی مەردان- بەرگی دووەم/ شێخە نەقشبەندییەکانی هەورامان و هەندێ لە مورید و مەنسووبە دیارەکانیان.
نووسین: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ٨٢٧، س: ١٩٨٣، ل:٦٦٨، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: یادی سەیید عەبدولڕەحیمی مەشهوور بە مەولەوی (کۆمەڵێک بابەت و نامە و وەسیەت و ...تاد)

٩- بنەماڵەی زانیاران
نووسین: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ئامادەکردن: محەممەد عەلی قەرەداخی، چاپ: یەکەم، چ: شەفیق، ش: بەغدا، ژس: ٦٤٠، س: ١٩٨٤، ل:٦٣٢، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بنەماڵەی سەیید عەبدولڕەحیمی مەولەوی/ نامەی شێخی سیراجەدین بۆ مەولەوی/ نامەی مەلا حامیدی کاتب بۆ مەولەوی/ شیعری مەلا حامید بە بۆنەی مردنی مەولەوییەوە/ دەقی



شەجەرەی مەولەوی.

١٠- ژیناوەری زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامەتی یا گەنجینەی فەرهەنگ و زانست
نووسین: محەممەد ساڵح ئیبراهیمی محەممەدی (شەپۆل)، چاپ: یەکەم، چ: مهارت، ش: تاران، ژس: ؟، س: ١٣٦٣ (١٩٨٤)، ل:٨٨٦، ق:١٧×٢٣
ناوەرۆک: مەولەوی تاوەگۆزی/ بۆ مەولەوی و پارچە شیعرێک.

١١- تەصەووف چییە؟ ڕێبازی نەقشبەندیی لە تەسەووفدا کامەیە؟ تەسەووف چ کارێکی کردووەتە سەر وێزەی وێژەی کوردی؟ تەسەووف چۆن و لە کەیەوە هاتووە؟ فەرقی فەلسەفە و تەسەووف چییە؟ فەرقی تەسەووفی ئیسلامی وە تەسەووفی بەر لە ئیسلام چییە؟
نووسین: ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشەبەندی، بە یارمەتی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپکراوە، چاپ: یەکەم، چ: دار ئەلحورییە، ش: بەغداد، ژس: ١٦٦٤، س: ١٩٨٥، ل:٥٥٩، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی هەشتەم: کاری تەسەووف لە ئەدەبی کوردیدا/ سەید عەبدولڕەحیم (مەولەوی)

١٢- کامیل ژیر و هۆنراوەی نەتەوەیی لە هەڵوێست و ڕەخنەدا- لێکۆڵینەوەی ئەدەبی
نووسین: ب.هەندرێن، چاپ: یەکەم، چ: مینا (ڕۆنیۆ)، ش: بەغدا، ژس: ٩٨٤، س: ١٩٨٥، ل:١٥٨، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: ئاوڕدانەوەیەک لە خاڵۆخاڵۆکەی مەولەوی و ژیر، یان ژیر ئاواتەکەی مامۆستا نەجمەدین مەلای هێنایە دی/ ڕۆشناییەک لەسەر خاڵۆی مەولەوی و خاڵۆ خاڵۆی ژیر.




١٣- ئەدەبی کوردی
نووسین: فریاد فازیل عومەر، لە بڵاوکراوەکانی خوێندنی کوردی بەرلین، چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: بەرلین، ژس: ؟، س: ١٩٨٦، ل:١٨٠، ق:١٥×٢١
ناوەرۆک: مەولەوی.
تێبینی: وەک لە چاپی دووەم نووسراوە چاپی یەکەمی لە ساڵی ١٩٧٦ لە سلێمانی چاپکراوە، کە دەستمان نەکەوتووە. هەروەها ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ISBN: 3-923446-27-6 وەرگرتووە.

١٤- کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی- بەرگی سێیەم
نووسین: محەمەد عەلی قەرەداخی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: دار ئەلحورییە، ش: بەغدا، ژس: ١٢٤٣، س: ١٩٨٦، ل:٣١٤، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: مەولەوی.

١٥- ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا
نووسین:خورشیدڕەشیدئەحمەد،لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: ئەلجاحیز، ش: بەغدا، ژس: ٦٩٨، س: ١٩٨٩، ل:٣٦٨، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: ئەدەبیاتی شێوەی گۆران/ مەولەوی.

١٦- گەنجینەی فەرهەنگ و زانین
نووسین: محەممەد ساڵح ئیبراهیمی (شەپۆل)، چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: تاران، ژس: ؟، س: ١٩٩٢، ل:١٥٠، ق:١٧×٢٣
ناوەرۆک: حەکیم مەولەوی کورد.

١٧- مێژووی وێژەی کوردی- نووسراوی ١
نووسین: سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، لە بڵاوکراوەکانی ئینتیشاراتی (ناجی) لە بانە، چاپ: یەکەم، چ: چهر تبریز، ش: تەورێز، ژس: ؟، س: ١٣٧٥ (١٩٩٦)، ل:٥٦٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: هۆنەرانی دەوری ئەردەڵان: مەولەوی.

١٨- بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە- بەرگی یەکەم
نووسین: محەممەد عەلی قەرەداخی، چاپ: یەکەم، چ: وەمیز، ش: بەغدا، ژس: ١٤٠، س: ١٩٩٨، ل:٣٩٢، ق:١٧×٢٣
ناوەرۆک: عەقیدەکانی مەولەویی/ خاڵۆ شەهاب و خاڵۆ مەولەویی و خاڵ.

١٩- ڕاوە گزنگ- ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

نووسین: محەممەد حەمەباقی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ: چ: ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٢٨٠، س: ١٩٩٨، ل:١٤٧، ق:١٦×٢٣
ناوەڕۆک: مەولەوی! یان گەڕانەوە بۆ سەرچاوە.

٢٠- کەشکۆڵی حاجی مەحموودی یاروەیس
نووسین: حاجی مەحموود یاروەیس، لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوە: عوسمان محەممەد هەورامی، چاپ: ؟، چ: بابان، ش: سلێمانی، ژس: ٧٨، س: ١٩٩٨، ل:٢٢٦، ق:١٦×٢٢
ناوەڕۆک: مەولەوی.

٢١- ئەنتۆلۆگیا
نووسین: محەمەدی مەلا کەریم و ئەوانی تر، ئامادەکردن و سەرپەریشتیکردن: خەبات عارف، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕەسەن، چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ستۆکهۆڵم، ژس: ؟، س: ١٩٩٩، ل:١٩٠، ق:١٦×٢٣
ناوەڕۆک: مەولەوی- ژیان و بەرهەمی: محەمەدی مەلا کەریم.
تێبینی: ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ISBN 6-1-972549-91 وەرگرتووە.

٢٢- زریزەی زێڕین
نووسین: محەمەد ساڵح ئیبراهیمی (شەپۆل)، لە




بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٢٢٧، س: ١٩٩٩، ل:١٦٦، ق:١٦×٢٣
ناوەڕۆک: شیعری مەولەوی.

٢٣- مەحموود پاشای جاف ١٨٤٦- ١٩٢١
نووسین: ئومێد ئاشنا، چاپ: یەکەم، چ: بینایی، ش: سلێمانی، ژس: ١١٦، س: ١٩٩٩، لا: ٣٦، ق:١٦×٢٠
ناوەڕۆک: بەشی دووەم و کۆتایی: مەولەوی و مەحموود پاشا.

٢٤- بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە- بەرگی سێیەم
نووسین: محەمەد عەلی قەرەداخی، چاپ: یەکەم، چ: ئەلخەنسا، ش: بەغداد، ژس: ٦١٢، س: ٢٠٠٠، ل:٤٠٠، ق:١٧×٢٤
ناوەڕۆک: ڕاستکردنەوەی مانای چوارینەیەکی مەولەوی.

٢٥- بارانی سلێمانی- بەرهەمی بڵاونەکراوە و لە یادکراوی محەمەد ساڵح دیلان
نووسین: محەممەد ساڵح دیلان، ئامادەکردن: ئومێد ئاشنا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٤٧٧، س: ٢٠٠١، ل:١٤٤، ق:١٤×٢٠
ناوەڕۆک: بەشی دووەم: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی/ شاعیری گەورە مەولەوی/ مەولەویی ڕۆمانتیک.

٢٦- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی- بەرگی یەکەم
کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە: ئومێد ئاشنا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٣١٤، س: ٢٠٠١، ل:٤٢٤، ق:١٦×٢٣
ناوەڕۆک: مەولەوی.

٢٧- ڕووناکی ١٩٣٥/١٠/٢٤ – ١٩٣٦/٥/١٦
یەکەمین گۆڤاری کوردیی شاری هەولێر
ئامادەکردن: د.کوردستان موکریانی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر،

ژس: ١٤٨، س: ٢٠٠١، ل:٤٤+ ٢١٨، ق:٢٠×٢٧
ناوەرۆک: ژ٦- هەندێ بابەتی وەک: مەلا عەبدولڕەحیم مەولەوی: حسێن حوزنی.

٢٨- بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە- بەرگی چوارەم
نووسین: محەمەد عەلی قەرەداخی، چاپ: یەکەم، چ: الخنساء، ش: بەغداد، ژس: ٨٧، س: ٢٠٠٢، ل:٤٠٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: وێنەی دەستخەت/ کەشکۆڵی شێخی حیسامەدین/ شیعری مەولەوی و کۆماسیی/ پارچەیەک شیعری مەولەوی.

٢٩- کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی- بەرگی پێنجەم- کەشکۆڵی عەبدولفەتاح
نووسین: محەممەد عەلی قەرەداخی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٢٣٩، س: ٢٠٠٢، ل:٢٩٥ ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: مەلا ڕەحیمی تایجۆزیی (مەولەوی)

٣٠-گۆران-نووسین و پەخشان و وەرگێڕانەکانی کۆکردنەوە و ڕێکخستن: ئومێد ئاشنا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ١٠، س: ٢٠٠٢، ل:١٧٣، ق:١٤×٢١
ناوەرۆک: مەولەوی و شیعری موناسەبات.

٣١- یادکردنەوەی ئەستێرە گەشاوەکانی ئەدەب و هونەر
نووسین: مارف ناسراو، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە- و.ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژس: ١٣٩، س: ٢٠٠٢، ل:٢٠٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: مەولەوی ١٨٠٦- ١٨٨٢

٣٢- پەیدابوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا تا جەنگی گێتی یەکەم
نووسین: عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٢٨٩، س: ٢٠٠٣، ل:١٢٠، ق:١٥×٢١
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم/ مەولەوی.

٣٣- خەرمان- شارا- تۆماری تەمەن- ئەرشیف ٣
نووسین: کەریم زەند، چاپ: یەکەم، چ: ئەزمەڕ، ش: سلێمانی، ژس: ١٧٥، س: ٢٠٠٣، ل:٦٢٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: مەولەوی/ ڕێبازگەی مەولەوی.

٣٤- سەرجەمی بەرهەمی حەسەن قزڵجی
نووسین: حەسەن قزڵجی، ئامادەکردن: موحسین قزڵجی، سەرپەرشتی: سدیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ١٣٤، س: ٢٠٠٣، ل:٥٤٠، ق:٢٠×٢٩
ناوەرۆک: ٣- وتار و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە: ئەمە ناهەقییە لە (مەولەوی) کراوە.

٣٥- مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی سێیەم/ ئەم بەرهەمە هێنانەدی پڕۆژەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە تا






ناوەڕاستی سەدەی بیستەم.
نووسین: د.مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٢٨٢، س: ٢٠٠٣، ل:٤٤٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی بیست و یەکەم: مەولەوی/ ژیانی مەولەوی/ دیوانی شیعری مەولەوی/ بەشی بیست و دووەم: گەشتێک لە گوڵزاری دیوانی مەولەویدا/ باوەڕ و بینین/ دڵداری و سروشت/ خۆشەویستی و مرۆڤایەتی/ فرمێسک و زام/ مرۆڤ و کردەوە/ ئێش و ئازار.

٣٦-خەیاڵ و ڕۆح- چەند تێڕوانینێک بۆ شیعری کوردی
نووسین: چەند نووسەرێک، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ٦٠٢، س: ٢٠٠٤، ل:٤٥٦، ق:١٤×٢٠
ناوەرۆک: شایییەکەی مەولەوی و چەند سەرنجێکی بەراوردکاری: عەبدولڕەزاق بیمار.

٣٧- عەقیدەی ئیمان- عەقیدەی کوردی «لوببەلعەقایید» کۆنترین دەستنووس: ١٨١٨/٣/٢١ کۆکردنەوە و کورتکردنەوە: خالید شارەزووری نەقشبەندی (مەولانا خالید)، ئاشناکردن و لێکۆڵینەوە: بابی لالۆ (کەمال ڕەئووف محەممەد)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ١٥٩، س: ٢٠٠٤، ل:٣٣٥، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: عەقیدەی ئیمان- دانان و نووسینی لە نێو کورددا/ سەرەقەڵەمە نامەیێکی کوردیی (مەولەوی)

٣٨- لێکۆڵینەوەکانی هەشتەمین فێستیڤاڵی گەلاوێژ ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ، چاپ: یەکەم، چ: سان، ش: سلێمانی، ژس:، س: ٢٠٠٤، ل:١٣٠، ق:٢١×٢٩
ناوەرۆک: نەغمە ڕەگەزی ڕەسەنایەتی مۆسیقای شیعری برگەیی و ناسککاری پرۆسەی بزاوتوویی لیریکای مەولەوی: عادل محەممەد پوور.

٣٩- مێژووی بیری کوردی
نووسین: مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد)، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ک)، چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژس: ٨٣٢، س: ٢٠٠٤، ل:١٨٢، ق:٢٠×٢٨
ناوەرۆک: چەپکێک لە گوڵزاری مەولەوی.

٤٠- مێژووی هۆزی جاف و ژیانی تیرەکانی
نووسین: مەحموود عەزیز حەسەن، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاک، چاپ: یەکەم، چ: خاک، ش: سلێمانی، ژس: ٥٦٢، س: ٢٠٠٤، ل:٢٥٢، ق:١٦×٢٢
ناوەرۆک: شاعیری گەورە و پایەبەرزی کورد- مەولەوی.

٤١- یاقووت و زمرووتی کوردی- ئایین و فەلسەفە (بەرگی دووەم)
نووسین: حسێن محەممەد عەزیز، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە- و.ڕۆشنبیری، چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ٦٥١، س: ٢٠٠٤، ل:٢٢٣، ق:١٥×٢٠
ناوەرۆک: هەوێنی هۆنراوەی کوردی/ ئایین و فەلسەفە/ کۆمەڵێک شاعیری کورد: مەولەوی.

٤٢- تاریخی سلێمانی وە وڵاتی- سەرجەمی بەرهەمی محەمەد ئەمین زەکی بەگ- سێیەم بەرگ
نووسین: محەممەد ئەمین زەکی بەگ، ئامادەکردن: ڕەفیق سالح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، چاپ: دووەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ٩٠٧، س: ٢٠٠٥، ل:٢٦٥، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە یەک.

٤٣- باخێک لە وشە- گەشتێک بە ژیاننامەی پڕ شکۆی پیرەمێرددا
نووسین: مستەفا سالح کەریم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ٢٢٠، س: ٢٠٠٦، ل:٢٦٩، ق:١٤×٢٠
ناوەرۆک: ڕێز و خۆشەویستی (مەولەوی) لای پیرەمێرد/ ڕازی نێوان شاعیران/ دۆستایەتی قەڵەم/ مەولەوی و ئێمە و مەولانای ڕۆمی.

٤٤- تۆماری تەمەن — ٧ ئایینستان- ئایین و باوەڕ و کوردستان- لانکەی پەیامبەران

نووسین: کەریم زەند، چاپ: یەکەم، چ: ئزمڕ ، ش: سلێمانی، ژس: ٩٥٠، س: ٢٠٠٦، ل:٣٩٤، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: ڕێبازگەی مەولەوی.

٤٥- خوێندنەوەیەکی تازەی هەڵبەستی کوردی
نووسین: عەبدولڕەزاق بیمار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٦٦١، س: ٢٠٠٦، ل:٢٢٩، ق:١٥×٢١
ناوەرۆک: شایییەکەی مەولەوی و چەند سەرنجێکی بەراوردکاری.

٤٦- گەڕان بە دوای ماناکانی شیعردا- خوێندنەوەی هەڵبژاردەیەک لە شیعری کوردی.
نووسین: عەتا قەرەداخی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ: حەمدی؟، ش: سلێمانی، ژس: ٤٦٠، س: ٢٠٠٦، ل:٢٧٦، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: ترسی (مردن و ئەفسانەی ئاوی حەیات) لە شیعری (وادەی سفیدەی...)ی (مەولەوی)دا.

٤٧- مودەڕیسنامە- مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس- سەربوردێک لە ژیان و ماندوبوونی گەورە زانای کورد
ئامادەکردن: ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد، پێداچوونەوە: محەممەدی مەلا کەریم و م.سەلاح عەبدولقادر، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا، چاپ: یەکەم، چ: ئارا، ش: سلێمانی، ژس: ٨١٨، س: ٢٠٠٦، ل:٨٧، ق:١٤×٢١
ناوەرۆک: ڕۆڵی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە ناساندن و ڕاڤەکردنی بەرهەمەکانی مەولەویدا.



٤٨- یادی مەردان- بەرگی دووەم- شێخە نەقشبەندییەکانی هەورامان و هەندێ لە مورید و مەنسووبە دیارەکانیان
نووسین: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لە بڵاوکراوەکانی «بڵاوکردنەوەی کوردستان- سنە، چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: ئێران، ژس: ؟، س: ١٣٨٥ (٢٠٠٦)، ل:٦٦٨، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمی هەیە بڕوانە کتێبی ژمارە هەشت.

تێبینی: ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ISBN: 964-7638-89-2 وەرگرتووە.

٤٩- یەکەمین فێستیڤاڵی ئەدەبی و ڕووناکبیری (ناوەندی ڕووناکبیریی هەڵەبجە)- کۆی سەرجەم شیعر و چیرۆک و لێکۆڵینەوەکانی یەکەمین فێستیڤاڵی ناوەندی ڕووناکبیریی هەڵەبجە.
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: ناوەندی ڕووناکبیریی هەڵەبجە، چاپ: یەکەم، چ: شەهید ئازاد هەورامی، ش: کەرکووک، ژس: ؟، س: ٢٠٠٦، ل:٣٠٤، ق:١٦×٢٤
ناوەرۆک: ڕەهەندی تەسەوف لە شیعری (مەولەوی)دا: ئەنوەر عەرەب.

٥٠- ئەندێشە جوانەکانی ڕۆح لە شیعری کوردیدا.
نووسین: ڕەئووف حەسەن، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپ: یەکەم ، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژس: ٨٦٥، س: ٢٠٠٧، ل:١٦٤، ق:١٤×٢٠
ناوەرۆک: ورشە ورشی چەند گەوهەرێک لە هەناوی دوو شیعرنامەی (مەولەوی)دا.

٥١- شێوە و ناوەڕۆک- کۆمەڵێک لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی.
نووسین: ئۆمێد ئاشنا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١١٤٧، س: ٢٠٠٧، ل:٢٤٧، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: کێشەی پاکژبوونەوە لە شیعرەکانی مەولەویدا.

٥٢- لە میحرابی ئەدەبدا- چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی.
نووسین: د.سەباح بەرزنجی، لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کۆمەڵ، چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژس: ٩٠٤، س: ٢٠٠٧، ل:٨٢، ق:١٦×٢٢
ناوەرۆک: چەند ئاماژەیەکی کەلامی فەلسەفی و عیرفانی لە بەرهەمەکانی (مەولەوی)دا- ڕۆڵی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە ناساندن و ڕاڤەکردنی بەرهەمەکانی مەولەویدا.

٥٣- یاقووت و زمڕووتی کوردی (سروشت و جوانی)- بەرگی سێیەم




نووسین: حسێن محەممەد عەزیز، چاپ: یەکەم، چ: سیما، ش: سلێمانی، ژس: ٤٣٣، س: ٢٠٠٧، ل:٣١٧، ق:١٤×٢٠

ناوەرۆک: زستان- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: مەولەوی/ بەهار- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: مەولەوی/ هاوین- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: مەولەوی/ پاییز- لە هۆنراوەی چەند شاعیرێکدا: مەولەوی.

تێبینی: جگە لە ژمارەی سپاردن کۆدی ISBN: 91-970560-8-1 وەرگرتووە.

٥٤- ئەلبوومی کەشکۆڵ- بەرگی یەکەم

نووسین: محەممەد عەلی قەرەداخی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژس: ١١٤١، س: ٢٠٠٨، ل:٣٤٦، ق:١٧×٢٤

ناوەرۆک: مەولەوی.

٥٥- بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە- بەرگی هەشتەم.

نووسین: محەممەد عەلی قەرەداخی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٠٨٥، س: ٢٠٠٨، ل:٣٩٨، ق:١٦×٢٣

ناوەرۆک: مەولەوی یەکەم و مەولەوی دووەم/ دۆزینەوەی دانراوێکی مەولەوی بە پەخشانی کوردی/ نامە و مۆر و ئیمزای مەولەوی/ مەولەوی و پەخشانی کوردی.

٥٦- بەرەو جیهانی شیعریی چەند شاعیرێک

نووسین: کەمال غەمبار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٦٧٨، س: ٢٠٠٨، ل:٤٠٨، ق:١٦×٢٤

ناوەرۆک: مەولەوی شاعیری ڕەوتی نوێخوازی.

٥٧- چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی

نووسین: د.محەممەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەباری)، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی- و.ڕۆشنبیری، چاپ: یەکەم، چ: ڕۆمان، ش: سلێمانی، ژس: ٢٥٣٧، س: ٢٠٠٨، ل:٣٠٦، ق:١٦×٢٢

ناوەرۆک: ٥- کاریگەریی دابڕان لە تێکستە شیعرییەکانی مەولەویدا.

٥٨- خەزێنە- کۆمەڵە وتار

نووسین: مەلا عەبدوڵڵا ئەحمەدییان (عەللامە)، لە بڵاوکراوەکانی نەشری ئیحسان، چاپ: یەکەم، چ: مەهارەت، ش: تاران، ژس: ؟، س: ١٣٨٧ (٢٠٠٨)، ل:٣٠٩، ق:١٥×٢١

ناوەرۆک: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی: مەولەوی و ئاسەوارەکانی لە دەلاقێکی نوێوە.

تێبینی: ژمارەی سپاردنی نییە و کۆدی ISBN: 978-964-356-5 وەرگرتووە.

٥٩- دەقنامە- بەیت و هۆنراوە کوردییەکان- بەرگی یەکەم

نووسین: محەممەد عەلی قەرەداخی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٧٦٩، س: ٢٠٠٨، ل:٣٦٧، ق:١٦×٢٣

ناوەرۆک: پەخشانی کوردی/ عەقیدەی مەولەوی بە پەخشانی کوردی.

٦٠- کۆڤارا چیا

ئامادەکرن: د.بەدرخان سندی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیرێز، چاپ:




یەکەم، چ: حاجی هاشم، ش: هەولێر، ژس: ٩٨٨، س: ٢٠٠٨، ل:١٠٥، ق:١٥×٢١
ناوەرۆک: ژمارە٢: مەولەوی: حەمە کەریم هەورامی.
تێبینی: ئەم گۆڤارە ٢ ژمارەی لێ دەرچووە کە یەکەم ژمارەی لە ساڵی ١٩٧٠ لە شاری هەولێر بووە/ ژمارەی دووش لە ساڵی ١٩٧١دا بووە.

٦١- مێژووی وێژەی کوردی- بەرگی یەکەم
نووسین: د.سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٩٤١، س: ٢٠٠٨، ل:٦٠٠، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە ١٧.




٦٢- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان و بەرهەمەکانی- بەرگی یەکەم
کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە: ئومێد ئاشنا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٥٥٦، س: ٢٠٠٩، ل:٤٢٤، ق:١٦×٢٢
ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە ٢٦

٦٣-زانایانی پیر خدری-لە بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگای دەستخەتەکانیانەوە
نووسین: ئەحمەد حەمید گەرمکی پیرخدری- ئەنوەر کامل گەرمکی پیرخدری، لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ساداتی پیرخدری، چاپ: یەکەم، چ: ڕەهەند، ش: سلێمانی، ژس: ١٤٨١، س: ٢٠٠٩، ل:٢٩٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: مەلا عەبدولڕەحیم (مەولەوی شاعیر)/ مەلا محەممەد کوڕی مەولەوی...

٦٤- مێژووی بیری کوردی
نووسین: مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد)، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ک)، چاپ: دووەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژس: ١٣٠٥، س: ٢٠٠٩، ل:٦٢٢، ق:١٨×٢٥
ناوەرۆک: چەپکێک لە گوڵزاری مەولەوی.

٦٥- بارانە وشە- کۆی نووسینەکان- بەرگی یەکەم نووسینە ئەدەبییەکان
نووسین: حەسەن جاف، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٢٢٩١، س: ٢٠١٠، ل:٤٢٤، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: مەولەوی.

٦٦- بەعسیزم و سەرکوتکردنی ژیان
نووسین: ڕامیار مەحموود، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژس: ١٣٧٩، س: ٢٠١٠، ل:١٨٥، ق:١٥×٢١
ناوەرۆک: چەمانەوە بەسەر بۆشاییدا- چەمکی مردن لای (مەلای جزیری و مەولەوی و مەحوی)

٦٧- پیاوێک گرەو لە نەمری دەباتەوە- مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە فێستڤاڵێکی تایبەت بە کۆمەڵەی ڕووناکبیریی کەرکووک ساڵی ٢٠٠٦
نووسین: ساڵح هەللاج، پێداچوونەوە: محەممەدی مەلا کەریم، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی

ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکووک، چاپ: یەکەم، چ: کارۆ، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ٢٠١٠، ل:٢٦٦، ق:١٥×٢٠
ناوەرۆک: ڕۆڵی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە ناساندن و ڕاڤەکردنی بەرهەمەکانی مەولەویدا: د.سەباح محەممەد بەرزنجی.

٦٨- چەند باسێکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و لێکۆڵینەوە لە هەندێکیان
ئامادەکردن: عالییە عەبدولکەریم مودەریس، چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژس: ١٤٦٢، س: ٢٠١٠، ل:٨٢، ق:١٦×٢٢
ناوەرۆک: لێکدانەوەی دوو نموونە لە شیعرەکانی مەولەوی.

٦٩- سۆزی لیریکا لە ئەزموونی شیعری کوردیدا- کۆمەڵە وتار
نووسین: عادل محەممەد پوور، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان، چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٢٤٦٨، س: ٢٠١٠، ل:٢٥٢، ق:١٤×٢١
ناوەرۆک: ئیماژکاری لیریکای مەولەوی/ خوێندنەوەی هونەری دەقێکی مەولەوی/ سەرپەنجەی دەسبازی دوو لیریکای گەورە/ تێبینییەک لەسەر پارچە لیریکایەکی بڵاونەکراوەی مەولەوی/ شیعری هاوچەرخی هۆرامان و ڕوونکردنەوەیەک.

٧٠- گۆڤاری ڕۆژی نوێ- ساڵی یەکەم (ژمارە ١-٦) (نیسان- ئەیلوولی ١٩٦٠)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح- ڕەفیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژس: ١٩٠٥، س: ٢٠١٠، ل:٢٠+٦٨٦، ق:١٦×٢٣
ناوەرۆک: ژمارە ٢ ساڵی ١-: یادی شاعیری نەمر (مەولەوی): نەجمەددین مەلا.

٧١- گۆڤاری هەتاو ١٩٥٤- ١٩٦٠/ بەرگی چوارەم- بەشی دووەم (ژمارە ١١٥-١٣٠)
ئامادەکردن: سدیق ساڵح، ڕەفیق ساڵح، عەبدوڵڵا زەنگەنە، پێشەکی و لێکۆڵینەوە: د.کوردستان موکریانی، پرۆژەی هاوبەشی بنکەی ژین و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپ: یەکەم، چ: باز، ش: هەولێر، ژس: ٥٧٧، س: ٢٠١٠، ل:٣٠١٥-٣٤٧٣+٥١، ق:١٧×٢٣
ناوەرۆک: ژ١١٨: مەولەوی (لامارتینی کورد): م.ڕەسووڵ.

٧٢- مێژووی ئەدەبی کوردی- بەرگی سێیەم/ نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم ١٨٠١- ١٨٥٠
نووسین: د.مارف خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٧٣١، س: ٢٠١٠، ل:٥٣٦، ق:١٥×٢١
ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە بڕوانە کتێبی ژمارە ٣٥

٧٣- هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا- بەرگی دووەم شاعیران
نووسین: حەکیم مەلا ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرێتی یادگاری هەڵەبجە، چاپ: یەکەم، چ: دیلان، ش: سلێمانی، ژس: ١٧٩٣، س: ٢٠١٠، ل:٢٨٠، ق:١٧×٢٤
ناوەرۆک: مەولەوی.

